# ڕوناكی شار و دێهات

# شەرحی

# (كشف الشبهات)

دانراوی ئیمام محمد كوڕی عبد الوهاب
ئامادە كردنی
إدریس كوڕی عبد العزیز

ساڵی ١٤٣٢ ی هیجری
چاپی یەكەم

- ناوی کتێب : ڕوناکی شار و دێهات شەرحی (كشف الشبهات)
- نوسەر : ئیمام محمد کوڕی عبد الوهاب
- ئامادەکردن و ڕوونکردنەوەی : إدريس کوڕی عبد العزيز
- چاپی : یەکەم
- چاپخانە: ڕێ نوێ
- تیراژ :(١٠٠٠) دانە
- ساڵی چاپ : ١٤٣٢ ی هیجری قەمەری
- ژمارەی سپاردنی : ( ) لە کتێبخانەی گشتی سلێمانی
- فرۆشتن بە ( ١٥٠٠) دینار

ماڵپەڕی توێشوو
http://tweeshu.blogspot.com

(صنف الشيخ رحمه الله تعالى (كشف الشبهات) وذكر الأدلة مِن الكتابِ والسنةِ على بطلانِ ما أوردهُ أعداءُ اللهِ ورسولهِ مِن الشبهاتِ، فأدحضَ حججهم، وبَيّنَ تهافتهم ، وكان كتاباً عظيم النفع على صغر حجمه، جليل القدر انقمع به أعداء الله وانتفع به أولياء اللهِ، فصار عَلَما يقتدي به الموحدون، وسلسبيلاً يرده المهتدون، ومن كوثره يشربون، وبه على أعداء الله يصولون، فلله ما أنفعه من كتاب، وما أوضح حججه من خطاب، لكن لمن كان ذا قلب سليم وعقل راجح مستقيم )

قاله سليمان بن سحمان رحمه الله في كتابه (الضياء الشارق)

(فإنّ رسالة كشف الشبهات للإمام المجدد السلفي المجاهد الشيخ محمد بن عبد الوهاب رحمه الله تعالى رسالة قيمة مباركة عظيمة الفائدة لما اشتملت عليه من حق ناصع مبين ، وجلاء لشبهات أهل الشرك والتلبيس على المسلمين ، وهي على صغرها تغني عن أسفار كثيرة ، وقد فتح الله بها قلوباً وبصائر كانت عن الحق غافلة وبالشرك عاملة ، وبرب العالمين ، وقدره جاهلة ، وهي جديرة أن تنشر في كل مكان وتترجم بكل لسان)

قاله الشيخ سفر الحوالي في تقديم لكتاب كشف الشبهات تحقيق أبو أنس الحسين بن عمر مروزي

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

# پێشەکی

إنَّ الحَمْدَ للهِ ؛ نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِينُهُ وَنَسْتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذُ بِاللهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنَا وَمِنْ سَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا، مَنْ يَهْدِهِ اللهُ فَلاَ مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضْلِلْ فَلاَ هَادِيَ لَهُ.

وَأَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ.وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ١٠٢ ﴾ آل عمران

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ١ ﴾ النساء

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ٧٠ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ٧١ ﴾ الأحزاب

أَمَّا بَعْدُ

**خودای بڵند فەرمویەتی { إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ } الحجر ٩**

**واتە : ئێمە ئەم قورئانەمان دابەزاندووە (کە باسی هەموو ئەو شتانەی تێدایە ئینسان پێویستی پێیەتی) هەر ئێمەش دەیپارێزین)**

**ئەم پاراستنەش دوو لایەنی هەیە لایەنێکیان خەبەرە و لایەنێکیان ئەمرە**

**یەکەمیان : خەبەریە کە خودا خەبەر دەدات پێمان کە هەرخۆی ئەم قورئانە دەپارێزێت ، دیارە کە حەدیس و فەرمودەکانی پێغەمبەریش ڕۆشنکەرەوەی قورئانن ، کەواتە حەدیسەکانیش دەپارێزێت. بەبێ زمانی عەرەبیش حاڵی بوون لە قورئان و حەدیس مەحاڵە کەواتە زمانی عەرەبیش دەپارێزێت .**

**بۆ پاراستنی ئەوانەش دەبێت کۆمەڵێك هەبن کە هەڵگری قورئان و سوننەت و زمانی عەرەبی بن . کە ئەوانەش ئەهلی سوننەت و جەماعەتن کە دەکاتە ئەصحابەکان و تابعین و (تابعی تابعین) ئەوانەش کە شوێن ئەوان کەوتون تا ڕۆژی قیامەت ، خوداش وەعدی ئەوەی داوە کە ئەو جەماعەتەش دەپارێزێت تا ڕۆژی قیامەت .**

وەك پێغەمبەر فەرموویەتی : (لَا تَزَالُ طَائِفَةٌ مِنْ أُمَّتِي عَلَى الْحَق) بەردەوام كۆمەڵێك لە ئومەتەكەم لە سەر حەق دەمێننەوە ،

<u>لایەنی دوومیان</u> : ئەمرە بە موسڵمانان كە پارێزگاری لە قورئان و زانستەكانی شەریعەت بكەن وەك زانستی تەوحید و حەدیس و زمانی عەرەبی. گەورەترین زانستیش عیلمی تەوحیدە . لە مێژووی ئیسلامیشدا چەندین جار زۆرینەی ئەم ئوممەتە لە ڕێبازە راستەقینەكەی ئیسلام لایداوە كە تەوحیدە، بەڵام خودای گەورە بە ڕەحمی خۆی و بە قەدەری خۆی سەبەبێكی ڕەخساندووە كە ئەم ئوممەتە بە شێوەیەكی فراوانتر بگەڕێنەوە سەر ڕێبازی تەوحید كە دینی هەموو پێغەمبەران و شوێنكەوتوانی ئەوانە ، یەكێ لەو سەبەبانەش ئیمام (محمد كوڕی عبد الوهاب )ە (رحمه الله) كە لە دەستی ئەودا خودای بەڕەحم بانگەوازی تەوحید و یەكخوداپەرستی تازە كردەوە ، یەكێ لە كارە گەورەكانی ئەو ئیمامە، ئەم نامە پڕ خێر و بەرەكەتەیە كە بە هۆیەوە خودا دڵەكانی پێ ڕۆشن كردەوە گەلێك شار و وڵاتی پێ ڕۆشن بوویەوە.

جا كە بینیم وەك پێویست بە زمانی كوردی خزمەتی نەكراوە دەستم دایە ئەم كارە بەو ئومێدەی لەو لایەنەوە بۆشاییەكم پڕ كردبێتەوە ، ببێتە مایەی ڕازی بوونی خودا و ببێتە ڕوناكی دڵان و ڕەواندنەوەی گومان و پوچەڵكردنەوەی دینی موشریكان و ببێتە (ڕوناكی شار و دێهات). تكایە هەر كەسێكیش هەڵەیەكی لێ بینی با ئیهمالی نەكات و بە قەڵەمێكی ڕۆشن ڕاستی بكاتەوە منیش و خەڵكیشی لێ ئاگادار بكاتەوە ئەمەش ڕێبازی ئەهلی عیلمە. لە هەر شوێنێكیشدا ناوی پێغەمبەر هاتبێت با نەشنوسرابێت تۆ پەلە مەكە لە خوێنەوەكەتدا و بە جوانی بڵێ (صلی الله علیه وسلم ) لە بەرامبەر ناوی هەر ئەصحابەیەكدا بڵێ (رضی الله عنه) لە بەرانبەر ناوی هەر زانایەكی شەریعەتدا بڵێ (رحمه الله) ئەگەر وات كرد ئەمێد دەكەم كە خودا صەلاوات لە تۆش بدات و لێت رازی بێت و رەحمت پێ بكات ئیتر لەوە زیاتر چیمان دەوێ.

ئامادەكار

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

دانەر ڕەحمەتی خودای لێ بێت بەناوی خوداوە دەستی کردووە بە نوسینی ئەم نامە موبارەکە. واتە : بە بەرەکەتی ناوەکانی ئەڵڵاوە کە ڕەحمان و ڕەحیمە دەست پێدەکەم و داوای کۆمەکی لێدەکەم.

# بەشی یەکەم لە ( كشف الشبهات )

## بڕگەی یەکەم : بانگەوازی تەواوی پێغەمبەران بۆ ئەوە بووە کە الله بەتەنها بپەرسترێت.

الحمد لله رب العالين، والصلاة والسلام على نبينا محمد وعلى آله وأصحابه أجمعين

**(كشف الشبهات ) واتە : ئاشکراکردن و لادانی ئەو مەسەلانەی جێی گومانن لای خەڵکانی نەشارەزا. مەبەست لادانی ئەو گومان و شوبهانەن کە لەناو خەڵکیدا بڵاوبوونەوە لەبارەی ئەولیاپەرستی، هاوار و هانابردن بۆ ئەوان. ئەمەش لە دوای سەردەمە چاکەکانەوە بە هۆی شیعەگەری و صۆفیگەریەوە بەناو خاکی موسڵماناندا بڵاو بوویەوە.**

اعْلَمْ رَحِمَكَ اللَّهُ
أَنَّ التَّوْحِيدَ هُوَ إِفْرَادُ اللَّهِ سبحانه وتعالى بِالعِبَادَةِ . وَهُوَ دِينُ الرُّسُلِ

**بزانە ، خودا ڕەحمت پێ بکات بەوەی کە لە ڕابردووەکانت خۆش بێت ، لەمەو دواش هیدایەتت بدات بۆ کاری چاکە و بەردەوامت بکات.**

**کە تەوحید تایبەتکردن و بە تەنها کردنی الله یە لە گشت جۆرەکانی عیبادەت و پەرستنەکاندا . ئەوەش دینی تەواوی ڕەوانەکراوەکانی الله یە ،**

**واتە : تەوحید ، عەقیدە و گوتە و کردەوەی هەر هەموویانە.**

واتە: ئەو پێغەمبەرانە بۆ ئەوە نەهاتوون کە بە خەڵکی بڵێن ئەی خەڵکینە بزانن کە تەنها الله خالقی ئێوەیە تەنها ئەو پەروەردگارە و هەموو شتێکی بەدەستە. چونکە کافرەکان باوەڕیان بەوە هەبوو.

*الذِي أرْسَلَهُمُ اللَّهُ بِهِ إِلَى عِبَادِهِ ، فَأَوَّلُهُمْ نُوحٌ عليه السلام ، أرْسَلَهُ اللَّهُ إِلَى قَوْمِهِ لَمَّا غَلَوْا فِي الصَّالِحِينَ : وَدّاً ، وَسُوَاعاً ، وَيَغُوثَ ، وَيَعُوقَ ، وَنَسْرًا .*

وَآخِرُ الرُّسُلِ مَحَمَّدٌ صلى الله عليه وسلم ، وَهُو الذِي كَسَّرَ صُوَرَ هَؤُلاءِ الصَّالِحِينَ ،

خوداش تەواوی ئەو پێغەمبەرانەی بەو تەوحیدەوە ناردووە بۆ گشت عەبدەکانی جا یەکەمیان نوح پێغەمبەر بوو ، خودا ڕەوانەی کرد بۆ ناو قەومەکەی ، کاتێ زیادەڕەویان کرد لە بارەی پیاوچاکان و خوداپەرستەکانەوە کە پێنج پیاوچاك بوون : (وەدد و سواع و یەغوس و یەعوق و نەصر) .

ئەخیری ئەو پێغەمبەرانەش محمد بوو ﷺ کە ڕەسم و پەیکەری ئەو پیاوچاکانەی لەساڵی فەتحی مەککەدا واتە لە هەشتی کۆچیدا شکاند .

سوئال : جیاوازی چییە لە نێوان نەبی و ڕەسول ؟

وەڵام : یەکەم ڕەسول بە شەریعەتێکی تازەوە هاتووە ، بەڵام نەبی لە سەر شەریعەتی پێغەمبەرەکەی پێشی خۆی دەڕوات

دووەم : ڕەسول ڕەوانە کراوە بۆ قەومی کافران ، بەڵام نەبی ڕەوانە کراوە بۆ ناو قەومێکی ئیماندار..

# بڕگەی دووەم : عەقیدە و كردەوەی ئەوانەی كە پێغەمبەریان بۆ ڕەوانە كرابوو

أرْسَلهُ اللَّهُ إِلَى أُنَاسٍ يَتَعَبَّدُونَ ، وَيَحُجُّونَ ، وَيَتَصَدَّقُونَ ، وَيَذْكُرُونَ اللَّهَ ، وَلَكِنَّهُمْ يَجْعَلُونَ بَعْضَ الْمَخْلُوقِينَ وَسَائِطَ بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ اللهِ ، يَقُولُونَ : نُرِيدُ مِنْهُم التَّقَرُّبَ إِلَى اللَّهِ ، وَنُرِيدُ شَفَاعَتَهُمْ عِنْدَهُ ، مِثْلَ الْملائِكَةِ وَعِيسَى ، وَمَرْيَمَ ، وَأُنَاسٍ غَيْرِهِمْ مِن الصَّالِحِينَ

خودا ئەو پێغەمبەرەی ﷺ ناردووە بۆ لای كەسانێك كە خواپەرستیان دەكرد، و حەجی ماڵی خودایان دەكرد خێر و صەدەقەشیان دەكرد و زیكر و یادی خودایان دەكرد بە زۆری. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەندێك لە مەخلوقاتەكانیان كرد بوو بە واسیتە لە بەینی خۆیان و الله دا.

دەیانگوت دەمانەوێت بەم كارەمان خۆمان لە خودا نزیك بكەینەوە و دەمانەوێت ئەو پیاوچاك و صاڵحانە لای خودا شەفاعەتمان بۆ بكەن وەك ملائیكەتەكان و عیسای كوڕی مەریەم و كەسانی دیكەش لە غەیری ئەمانە كە پیاوچاك بوون وەك (لات ) كە پەیكەری پیاوچاكێك بووە خواردنی بەسەر حاجیاندا دابەش دەكرد .

فَبَعَثَ اللّهُ مُحَمَّدًا صلى الله عليه وسلم يُجَدِّدُ لَهُمْ دِينَهُمْ دِينَ أَبِيهِمْ إِبْرَاهِيمَ ، وَيُخْبِرُهُمْ أنَّ هَذَا التقَرُّبَ وَالاعْتِقَادَ مَحْضُ حَقِّ اللَّهِ ، لا يَصْلُحُ مِنْهُ شَيْءٌ لِغَيْرِهِ لا لِمَلَكٍ مُقَرَّبٍ ، وَلا نَبِيٍّ مُرْسَلٍ ، فَضَلاً عَنْ غَيْرِهِمَا

خوداش محمدی ڕەوانە كرد ﷺ كە دینی ئیبراهیمی باوكیان بۆ تازە و زیندوو بكاتەوە ، وە خەبەریان پێ بدات كە ئەم خۆ نزیككردنەوەیە لە پیاوچاكان و ئەو جۆرە عەقیدە پێ بوونە تەنها ماف و حەقی خودایە. هیچ كام لەو كارانە بۆ غەیری خودا ناگونجێت، نە بۆ هیچ مەلائیكەیەكی نزیك لە خودا و نە بۆ هیچ پێغەمبەرێكی ڕەوانەكراو، جا چ جای ئەوەی كە بۆ غەیری ئەوان ئەنجام بدرێت.

وَإلاَّ فَهَؤُلاءِ اَلْمُشْرِكُونَ . يَشْهَدُونَ أنَّ اللَّهَ هُوَ الخَالِقُ وَحْدَهُ لا شَرِيكَ لَهُ ، وَأَنَّهُ لا يَرْزُقُ إلاَّ هُوَ، وَلا يُحْيِي وَلا يُمِيتُ إلاَّ هُوَ، وَلا يُدَبِّرُ الأَمْرَ إلاَّ هُوَ ، وَأنَّ جَميع اَلسَّمَاوَاتِ السَّبْعِ ، وَمَنْ فِيهِنَّ ، وَالأَرَضِينَ السَّبْعِ وَمَنْ فِيهَا كُلَّهُمْ عَبِيدُهُ ، وَتَحْتَ تَصَرُّفِهِ وَقَهْرِهِ

**خۆ ئەگەرنا ئەو موشریكانە شایەدیان دەدا كە الله هەر خۆی خالقە و هیچ شەریكی نییە هیچ كەس ڕۆزیدەر نییە تەنها ئەو نەبێت . هیچ كەس ژیان نابەخشێت تەنها ئەو نەبێت . هیچ كەس مەرگ ناهێنێت تەنها ئەو نەبێت.**

**هیچ كەس كاروبارەكان نابات بەڕێوە تەنها ئەو نەبێت.**

**وە ئەو كافرانە عەقیدەشیان وا بوو كە هەموو ئاسمانەكان و هەرچیان تێدایە و هەموو زەمینەكان و هەرچیان تێدایە هەموویان عەبدی خودان و لە ژێر دەسەڵات و قەهری خودادان .**

فَإذَا أَرَدت اَلدَّلِيلَ عَلَى أنَّ هَؤُلاءِ الْمُشْرِكِينَ الَّذِينَ قَاتَلَهُم رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم يَشْهَدُونَ بِهَذَا فَاقْرَأْ قوله تعالى:{قُلْ مَنْ يَرْزُقُكُمْ مِنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ أَمَّنْ يَمْلِكُ السَّمْعَ وَالأَبْصَارَ وَمَنْ يُخْرِجُ الْحَيَّ مِنَ الْمَيِّتِ وَيُخْرِجُ الْمَيِّتَ مِنَ الْحَيِّ وَمَنْ يُدَبِّرُ الأَمْرَ فَسَيَقُولُونَ اللَّهُ. فَقُلْ أَفَلا تَتَّقُونَ} يونس : ٣١

**جا ئەگەر بەڵگەت دەوێت لە بارەی ئەوەی كە ئەو موشریكانەی كە پێغەمبەری خودا ﷺ جەنگی لەگەڵدا كردن، شایەدیان دەدا لەسەر ئەو شتانە ، ئەگەر بەڵگەت دەوێت لەبارەی ئەم مەسەلە گرنگەوە ، ئادەی ئەو ئایەتە بخوێنەرەوە كە الله فەرموویەتی : {قُلْ مَنْ يَرْزُقُكُمْ مِنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ ..}تاكۆتایی**

**واتە:( لەو كافرانە بپرسە كێ ڕزقی ئێوە دەدات لە ئاسمان و زەوییەوە یان كێ گوێ و چاوەكانی دروستكردووە و بە ئێوەی بەخشیوە . یان كێ زیندووەكان لە مردووەكان دەردەهێنێت (وەك دەرهێنانی گژوگیا و بەروبومەكان لە دانەوێڵەكان، وەك دەرهێنانی ئیماندار لە دایك و باوكی كافر، وەك دەرهێنانی**

باڵندە لە هێلکە)  یان ئەوە کێیە هەموو کاروباری ئاسمانەکان و زەوی دەبات بەڕێوە. بەتەئکید ئەو کافرانە لە وەڵامدا دەڵێن تەنها الله.

دەی تۆش پێیان بڵێ : ئەی کافرەکان مادام زانیتان کە تەنها خودا ئەو کارانە دەکات، ئەی بۆ چی خۆتان ناپارێزن لە عەزابی خودا ، بەوەی کە عیبادەتەکان تەنها بۆ خودا ئەنجام بدەن و هیچ شتێکی دیکە نەکەن بە شەریکی خودا.

وقوله: {قُلْ لِمَنِ الأَرْضُ وَمَنْ فِيهَا إِنْ كُنْتُمْ تَعْلَمُونَ سَيَقُولُونَ لِلَّهِ قُلْ أَفَلا تَذَكَّرُونَ قُلْ مَنْ رَبُّ السَّمَاوَاتِ السَّبْعِ وَرَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ سَيَقُولُونَ لِلَّهِ قُلْ أَفَلا تَتَّقُونَ قُلْ مَنْ بِيَدِهِ مَلَكُوتُ كُلِّ شَيْءٍ وَهُوَ يُجِيرُ وَلا يُجَارُ عَلَيْهِ إِنْ كُنْتُمْ تَعْلَمُونَ سَيَقُولُونَ لِلَّهِ قُلْ فَأَنَّى تُسْحَرُونَ} المؤمنون : ٨٤ ، ٨٩

ئەو ئایەتەش بخوێنەرەوە کە الله فەرموویەتی :﴿ ئەی محمد ﷺ بپرسە لەو کافرانە ئەم زەمینە و هەر چییەکی تێدایە کێ دروستی کردون و کێ خاوەنیانە، ئەگەر دەزانن ؟ ئەو کافرانە بە تەئکید لە وەڵامدا دەڵێن تەنها الله.

تۆش لە وەڵامدا پێیان بڵێ: ئەی بۆ یاد ناکەن و بیرناکەنەوە کە ئەو کەسەی خاوەن و خالقی هەموو شتەکانە هەر ئەویش شایستەی پەرستنە.

ئنجا لێیان بپرسە : کێ دروستکەر و خاوەنی حەفت ئاسمانەکانە وە کێ پەروەردگار و خاوەنی عەرشی مەزنە ؟

جا بە تەئکید ئەو کافر و موشریکانە لە وەڵامدا دەڵێن : تەنها الله . جا کە دانیان بەوەدا نا وە ئیعترافیان کرد تۆش بڵێ : دەی کە ئەوانە دەزانن ، چۆن سیحرتان لێدەکرێت و لە خشتە دەبرێن لە بارەی حەقیقەتەوە )

وَغَيْرَ ذَلِكَ مِنَ الآيَاتِ

غەیری ئەمەش چەندەها ئایەتی دیکەش هەیە کە ئەم مەسئەلەیە بە جوانی ڕوون دەکاتەوە

بە کورتی ئەوانەی کە پێغەمبەریان ﷺ بۆ ڕەوانە کرا بوو دوو صیفەتیان هەبوو

یەكەم : دانیان دەنا بەوەدا كە ﷲ پەروەردگاریانە .

دووەم : هەندێك عیبادەتیان بۆ ﷲ ئەنجام دەدا.

كەواتە عەرەبە كافرەكان، ئەوانەی كە پێغەمبەریان ﷺ بۆ ڕەوانە كرابوو، دانیان دەنا بەوەدا كە تەنها ﷲ پەروەردگارە.

دانەریش چەند بەڵگەیەكی هێناوە لەسەر ئەوەی كە ئەوان دانیان دەنا بە پەروەردگاری ﷲ دا و چەند جۆرە عیبادەتێكیشیان بۆ ﷲ ئەنجام دەدا .

ئەو موشریكانە حەجیان دەكرد بە بەڵگەی ئەوەی كە ﷲ فەرمویەتی:

﴿ ثُمَّ أَفِيضُواْ مِنْ حَيْثُ أَفَاضَ ٱلنَّاسُ ﴿١٩٩﴾ ﴾ البقرة

لە حەدیسی صەحیحدا هاتووە كە كافرەكان لە تەلبیەی حەجدا دەیانگوت :

(لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ لَبَّيْكَ لَا شَرِيكَ لَك ، إلا شريكا هو لك ...)

كافرەكان خێر و صەدەقەشیان دەكرد .

لە كاتی ناڕەحەتی وموصیبەتا یادی خودایان دەكرد

لە عاشورادا بەڕۆژوو دەبوون، لەگەڵ ئەوەشدا هیچ سوودی پێ نەگەیاندن ، مادام لەو عیبادەت و خودا پەرستیانەدا خودایان بە تەنها دانەناوە .

جا ئەگەر ئینسان هاتوو دانی نا بەوەدا كە ﷲ هەرخۆی خالقە، بەڵام سەربڕینی بۆ غەیری ﷲ ئەنجام دا، ئەو دانپێدانانە هیچ سوودی نییە. بەڵكو دەبێت تەوحید لە خۆیدا بەدی بهێنێت هەم لە پەرستراویدا و هەم لە پەروەردگاریدا.

دەبێت هەموو سەربڕینەكانی تەنها بۆ ﷲ ئەنجام بدات .

دەبێت هەموو نەزرەكانی تەنها بۆ ﷲ ئەنجام بدات.

دەبێت هەموو عیبادەتەكانی تەنها بۆ ﷲ ئەنجام بدات .

(یتعبدون) واتە ئەو كافرانە عیبادەتیان بۆ خودا دەكرد، ئەوە بوو لە عاشورادا بەڕۆژوو دەبوون و لە كەعبەدا دەمانەوە بۆ عیبادەت و ئیعتیكافیان دەكرد بۆ خودا .

(ويحجون ) هەروەها حەجی ماڵی خودایان دەكرد.

(ويتصدقون ) وه خێر و صەدەقەشیان دەكرد .

(ويذكرون الله كثيرا ) زیكری خوداشیان دەكرد بە زۆری . بە پێی ئایەتی قورئان لە كاتی سەختی و ناخۆشیدا هاواریان لە خودا دەكرد .

( ولكنهم يجعلون بعض المخلوقات وسائط بينهم وبين الله)

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ لە دروستكراوەكانیان كردبوو بە واصیتە لە بەینی خۆیان و خودادا وەك مەلائیكەتەكان و عیسا و پیاوچاكان و صاڵحان . ئەمەش ئەو شیركەیان بوو كە دەهاتن دەیانگوت ئەی عیسا لای خودا داوامان بۆ بكە كە پێویستیەكانمان بۆ بێنێتە دی. یان داوایان لە یەكێك لە صاڵحان دەكرد چونكە ئەو صاڵحانە لای خودا پلەوپایەی بەرزیان هەبووە.

عادەتیشان وا بووە دەڕۆشتن بۆ لای بت و پەیكەرەكانیان ، و حەیوانیان بۆ سەر دەبڕین، بۆ ئەوەی لای ﷲ تكا و شەفاعەتیان بۆ بكەن ، ئەمە عەقیدەی یەكەمیان بوو .

عەقیدەی دووەمیان شایەدیان دەدا كە ﷲ هەر خۆی خالق و ڕازقە، هەر خۆی ژیان و مەرگی بەدەستە. كەواتە ئەو كافرانە تەوحیدیان لە ڕووی پەروەردگاریەوە تێدا مەوجود بووە. بەڵگەش ئەو ئایەتەی یەكەم بوو كە فەرمووی :( فسيقولون الله) لەگەڵ ئەو ئایەتەی دووەم كە فەرمووی (سيقولون الله)

# بڕگەی سێیەم : ئەو تەوحیدەی کە کافرەکان ئینکاریان لێکرد و لەسەری جەنگ لە دژیان بەرپا کرا ، تەوحیدی یەکخودا پەرستی بوو

إِذَا تَحَقَّقْتَ أَنَّهُمْ مُقِرُّونَ بِهَذَا ، وَلَمْ يُدْخِلْهُمْ في التَوْحِيدِ الَّذِي ، دَعَاهُمْ إِلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم

**جا مادام بۆت دەرکەوت بەپێی ئەو بەڵگانە کە ئەوان دانیان دەنا بەوەدا کە ﷻ هەر خۆی پەروەردگارە .**
**بەوەش نەهاتنە ناو ئەو تەوحیدەوە کە پێغەمبەری خودا بانگەوازی بۆ دەکردن کە تەوحیدە لە ئەنجامدانی پەرستنەکاندا . واتە (توحيد الألوهية )**

وَعَرَفْت أن التَّوحِيدَ الَّذِي جَحَدُوهُ هُوَ تَوْحِيدُ العِبَادَةِ ، الَّذِي يُسَمِّيهِ الْمُشْرِكُونَ فِي زَمَانِنَا الاعْتِقَادَ ، كما كَانُوا يَدْعُونَ اللَّهَ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى لَيْلاً وَنَهَاراً :
ثُمَّ مِنْهُمْ مَنْ يَدْعُو اَلْمَلائِكَةَ لأَجْلِ صَلاحِهِمْ ، وَقُرْبِهِمْ مِن اللَّهِ ؛ لِيَشْفَعُوا لَهُ.
أَوْ يَدْعُو رَجُلاً صَالِحاً مِثْلَ اللاَّتِ أَوْ نَبِيًّا مِثْلَ عِيسَى ،

**زانیشت کە ئەو تەوحیدەی کە ئەوان ئینکاریان لێدەکرد تەوحیدی عیبادەت بوو کە موشریکەکانی ئەم زەمانە ،( واتە : زەمانی شێخ محمد) پێی دەڵێن عەقیدە پێ بوون . واتە کافرەکانی سەردەمی پێغەمبەر ﷺ عەقیدەیان وا بوو هەرکەسێ عەقیدەی بە هەرشتێ هەبێت و هاواری لێ بکات قوربانی بۆ بکات ئەوا ئەو شتە کارەکەی بۆ ڕایی دەکات ، جا لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ بەو شتە دەگوترا (ئیلاه ) لە سەردەمی شێخ محمد دا پێی دەگوترا عەقیدە بوون بەو شتە ، لای خۆشمان هەر وایە . فەقەت ناوەکەی جیایە. پێی دەڵێن عاقییە بوون ، بە پەرستراوەکانیشان دەڵێن ڕۆحیانەتی ئەولیاکان.**

**هەروەك ئەو موشریكانە شەو و ڕۆژ خوداپەرستیان دەكرد و داوای پێویستیەكانیان لە خودا دەكرد .**

(ثُمَّ مِنْهُمْ مَنْ يَدْعُو اَلْمَلائِكَةَ لأَجْلِ صَلاحِهِمْ ، وَقُرْبِهِمْ مِن اللَّهِ ؛ لِيَشْفَعُوا لَهُ. )

**١. جا هەیان بوو مەلائیكەتی دەپەرست ، چونكە ملائیكەتەكان صالحن و لە خوداوە نزیكن ، بۆ ئەوەی لای خودا شەفاعەتیان بۆ بكەن .**

**٢. یان داوایان لە پیاوچاكان و صالحان دەكرد كە پێویستیەكانیان بۆ جێ بە جێ بكات وەك ( لات )**

**٣. یان داوایان لە پێغەمبەرێك دەكرد و پەرستنیان بۆ دەكرد وەك عیسا.**

| |
|---|
| وَعَرَفْتَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم<br>قَاتَلَهُمْ عَلَى هَذَا الشِّرْكِ وَدَعَاهُمْ إِلَى إِخْلاَصِ الْعِبَادَةِ لِلَّهِ وحدَهُ |

**زانیشت كە پێغەمبەر ﷺ لە سەر ئەم شیركە جەنگی لەگەڵدا كردن ، وە بانگی كردن كە هەموو جۆرەكانی عیبادەت تەنها بۆ ﷲ ئەنجام بدەن .**

| |
|---|
| كَمَا قَالَ تَعَالَى: {فَلا تَدْعُو مَعَ اللَّهِ أَحداً} الجن ١٨<br>وقال: {لَهُ دَعْوَةُ الْحَقِّ وَالَّذِينَ يَدْعُونَ مِنْ دُونِهِ لا يَسْتَجِيبُونَ لَهُمْ بِشَيْءٍ} |

**هەروەك ﷲ فەرمویەتی :{فَلا تَدْعُو مَعَ اللَّهِ أَحَداً} لەگەڵ ئەوەدا كە ئێوە داوا لە خودا دەكەن و ئەو دەپەرستن، نەكەن داوا لە هیچ كەسی دیكە بكەن و پەرستنی بۆ ئەنجام بدەن.**

**وە فەرمویەتی {لَهُ دَعْوَةُ الْحَقِّ وَالَّذِينَ يَدْعُونَ مِنْ دُونِهِ لا يَسْتَجِيبُونَ لَهُمْ بِشَيْءٍ}**

**واتە: هەرچی پەرستن و داواكردنی بە حەقە كە شیركی تێدا نەبێت تەنها ئەوە بۆ ﷲ یە، ئەوانەش كە موشریكەكان داوایان لێدەكەن و عیبادەتیان بۆ ئەنجام دەدەن ، هیچ جوابیان نادەنەوە. واتە نە زیانیان لێ لادەدەن و نە سودیان پێدەگەیەنن ، ئەمەش وەك ئەو كەسە وایە كە پەنجەكانی دەستی بڵاو دەكاتەوە و دەیكات بەناو ئاودا و دەیبات بۆ دەمی.**

**<u>دوو جۆر داواكردن هەیە</u>**

زانایان داواكردنیان كردووه بە دوو بەشەوە :

١. داواكردن بە عیبادەت ( **دعاء العبادة** ) : ئەمەیان بەوە دەبێت كە هەر جۆرە عیبادەتێك بۆ هەر كەسێ ئەنجام بدرێت ، بۆ نمونە كاتێ یەكێك نوێژ دەكات یان ڕۆژوو دەگرێت ئەوە بە زوبانی حاڵ داوا دەكات كە خودا لێی خۆش ببێت یان لە عەزابی خۆی پەنای بدات . ئەنجامدانی ( صرف) ئەم جۆرە داواكردنە بۆ غەیری ﷲ شیركی گەورەیە و موسڵمانی پێ لە دین دەردەچێت .

٢.داوا كردن بە زمان ( **دعاء المسألة** ): ئەمەیان داواكردنە بۆ بەدیهێنانی قازانجێك یان بۆ لادانی زیانێك ، ئەمەیان دوو جۆرە.

یەكەمیان : ئەگەر داوالێكراوەكە چوار مەرجی تێدا بوو (حیا حاضرا سمیعا قادرا)

زیندوو بوو ، حازر بوو، گوێی لێ بوو، تواناشی هەبوو كارەكەت بۆ بكات ، ئەمە شیرك نییە .

دووەمیان : ئەگەر داوا لێكراوە ، مردوو بوو یان غائیب بوو یان گوێبیست نەبوو یان لە توانایدا نەبوو كارەكە ئەنجام بدات ئەوە شیركی گەورەیە .

وَتَحَقَّقْتَ أنَّ رَسُولَ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم قَاتَلَهُمْ لِيكُونَ الدُّعَاءُ كُلُّهُ لِلَّهِ ، وَالذَّبْحُ كُلُّهُ لِلَّهِ ، وَالنَّذْرُ كُلُّهُ لِلَّهِ ، وَالاسْتِغَاثَةُ كُلُّهَا بِاللَّهِ وَجَمِيعُ أنْوَاعِ الْعِبَادَات كُلُّهَا لِلّهِ

بۆشت ئاشكرا بوو كە پێغەمبەری خودا ﷺ جەنگی لە دژیان بەرپا كرد ، بۆ ئەوەی هەموو جۆرەكانی داوا كردن تەنها بۆ الله بێت ،

هەموو جۆرە نەزرێك تەنها بۆ ﷲ بێت ، سەربڕینەكان و قوربانیەكان تەنها بۆ ﷲ بێت.

داواكردن بۆ ڕزگاركردن لە تەنگانەدا ، هەموو جۆرەكانی كەم و زۆری ، تەنها بۆ ﷲ بێت . گشت جۆرەكانی عیبادەت تەنها بۆ ﷲ بێت.

وَعَرَفْتَ أنَّ إِقْرَارَهمْ بِتَوْحِيدِ الرُّبُوبِيَّةِ لَمْ يُدْخِلْهُمْ فِي الإِسْلاَمِ ، وَأَنَّ قَصْدَهُم الْمَلائِكَةَ ، أَوْ

الأنْبِيَاءَ ، أَوْ الأَوْلِيَاءَ يُرِيدُونَ شَفَاعَتَهُمْ وَالتَّقَرُّبَ إِلَى اللَّهِ بِذَلِكَ هُوَ الَّذِي أَحَلَّ دِمَاءَهُمْ وَأَمْوَالَهُمْ عَرَفْتَ حِينَئِذٍ التَوْحِيدَ الَّذِي دَعَتْ إِلَيْهِ الرُّسُلُ ، وَأَبَى عَنِ الإِقْرَارِ بِهِ الْمُشْرِكُونَ

**زانیشت ئەوانە کە دانیان دەنا بەوەدا کە ﷲ هەر خۆی پەروەردگارە، و هەموو شتێکی بەدەستە، بەم عەقیدەیە نەهاتنە ڕیزی ئیسلامەوە. ئەوەشت زانی کە داوایان لە مەلائیکەتەکان، یان لە پێغەمبەران، یان لە ئەولیا و پیاوچاکان دەکرد. نیازیان ئەوە بوو کە لای خودا شەفاعەت و تکایان بۆ بکەن ، و نزیکیان بکەنەوە لە خودا . هەر ئەم کارەیان بوو وای لێکردن کە خوێن و ماڵیان حەڵاڵ کرا (بۆ موسڵمانەکان ).**

**کە ئەوانەشت زانی، ئنجا بۆت دەردەکەوێت کە ئەو تەوحیدە کامەیە کە پێغەمبەرەکان بانگەوازیان بۆ دەکرد و موشریکەکانیش ملیان نەدەدا کە دانی پێدا بنێن.**

قال ابن الفوزان [ومعرفة ذلك أمرٌ مهمٌ جدًا إذ به يُعرف التوحيد والشرك والإسلام والكفر. والجهلُ بذلك ضررُه عظيم وخطره كبيرٌ لأنّ الإنسان قد يخرجُ من الإسلامِ وهو لا يدري]

**واتە : (حاڵی بوون و تێگەیشتن لەم مەسەلەیە یەکجار گرنگە ، چونکە بە هۆی ئەمەوە تەوحید و شیرك وە ئیسلام و کوفر دەناسرێتەوە. نەزانین و ئاگادار نەبوون لەم مەسەلەیە مەترسیەکی زۆر گەورەیە ، چونکە هەندێ جار ئینسان لە ئیسلام دەردەچێت و هەر بە خۆشی نازانێت)**

## بڕگەی چوار : موشریکەکان مەعنای لاإله إلاّ الله یان دەزانی

وَهَذَا التَّوْحِيدُ هُوَ مَعْنَى قَوْلِكَ : (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ) ؛ فَإِنَّ الإِلَهَ عِنْدَهُمْ هُوَ الَّذِي يُقْصَدُ لأَجْلِ هَذِهِ الأُمُورِ ، سَوَاءً كَانَ مَلَكًا ، أَوْ نَبِيًّا ، أَوْ وَلِيًّا، أَوْ شَجَرَةً ، أَوْ قَبْرًا ، أَوْ جِنِّيًّا، لَمْ يُرِيدُوا أنَّ (الإِلَهَ) هُوَ الْخَالِقُ الرَّازِقُ الْمُدبِّرُ ، فَإِنَّهُمْ يَعْلَمُونَ أنَّ ذلِكَ لِلَّهِ وَحْدَهُ كَمَا قَدَّمْتُ لَكَ ، وَإِنَّمَا يَعْنُونَ بِ (الإِلَهِ) مَا يَعْنِي الْمُشْرِكُونَ فِي زَمَانِنَا بِلَفْظِ (السَّيِّدِ) ، فَأَتَاهُم النَّبِيُّ صلى الله عليه وسلم يَدْعُوهُمْ إِلَى كَلِمَةِ التَّوْحِيدِ ، وَهِي (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ)

**ئەم تەوحیدە کە تەوحیدی یەکخوداپەرستیە هەمان مەعنای ( لا إله إلا الله ) یە چونکە (ئیلاه) لای کافرەکانی سەردەمی پێغەمبەر ﷺ ، واتە: ئەو کەسەی کە جێی نیازە و ئەو کارانەی بۆ ئەنجام دەدرێت کە پێیان دەگوترێت عیبادەت . فەرقی نییە جا با ئەو کەسە ملائیکەت بێت یان پێغەمبەرێك بێت یان وەلی خودا بێت یان پیاوچاکێك بێت یان هەر قەبرێك بێت یان جنی بێت .**

**کافرەکانی سەردەمی پێغەمبەر کە گوتویانە پەرستراوەکانمان ئیلاهن مەبەستیان ئەوە نەبووە کە ئەو پەرستراوانە خالقن یان ڕزقی خەڵك دەدەن یان کارو بارەکانیان بە دەستە، چونکە ئەوان دەیانزانی کە ئەو کارانە تەنها کاری خودان.**

**بەڵکو مەبەستیان لە (ئیلاه) هەر ئەوە بووە کە موشریکەکان لەم سەردەمەدا پێی دەڵێن (السید) یان پێی دەڵێن (شێخ) یان (ئەولیا) یان (غەوس).**

**پێغەمبەریش ﷺ هات بۆ لایان بانگەوازی ئەوانی کرد بۆ بەدیهێنانی تەوحید کە ئەویش ( لا إله إلا الله ) یە مەبەستیش لەم وتەیە مەعناکەیەتی نەك تەنها گوتنی سەر زارەکی.**

روونكردنەوە: (ئیلاه) واتە ئەو كەسەی كە جێی نیازە و مەقصودە لە ئەنجامدانی ئەو گوتە و كردەوانەدا كە بە عیبادەتكردن حسێبن، ئەمەش یەكدەنگی لە سەرە لە لایەن زماناسانی عەرەبییەوە.

لای ئەهلی سوننەش هەر وایە ، (ئیلاه ) واتە پەرستراوی جێی مەبەست : ئەو كەسەیە كە هەر جۆرە عیبادەتێكی بۆ ئەنجام دەدرێت.

بەڵام ئەشعەریەكان و صۆفییەكان و جەهمیەكان و ڕافیزەكان و سەردەمپەرستان دەڵێن :(ئیلاه ) واتە پەروەردگار واتە خالق.

به پێی ئەم عەقیدەیە موشریكەكان دێنە ڕیزی تەوحیدەوە .

ئەمەش مەترسیدارترین لادانە لای ئەشعەریەكان و غەیری ئەوانیش لە ئەهلی بیدعە ، چونكە ئەوان ئیلاه بە مەعنای پەروەردگاری لێك دەدەنەوە . تەواو

(عبد اللطيف بن عبد الرحمن بن حسن) رحمهم الله دەڵێت :

(إن المشركين الأولين يقصدون من لفظ الإله ما يقصده أهل زماننا بلفظ السيد وهذا صحيح ؛ فإن السيد عند أكثر المشركين في هذه الأزمان هو الذي يدعى ويستغاث به في الشدائد ، ويرجى للنوازل ويحلف باسمه ، وينحر له على وجه التعظيم والقربة ، وبعضهم يطلق على ذلك اسم الولي كما في اصطلاح كثير من أهل مصر ، منهاج التأسيس ٣١٣- ٣١٤)

واتە : موشریكەكانی زوو مەبەستیان لە وتەی ( ئیلاه) ، هەر ئەوەیە كە خەڵكی ئەم زەمانە پێی دەڵێن سەید ، چونكە سەید لای زۆربەی موشریكەكانی ئەم سەردەمە ، ئەو كەسەیە كە داوای لێدەكرێت و لە تەنگانەدا هاواری بۆ دەبرێت ، لەكاتی بەڵا و موصیبەتا جێی ئومێدە. و سوێندی پیٚ دەخورێت . قوربانی بۆ دەكرێت چونكە بە گەورەی دەزانرێت و خۆی لیٚ نزیك دەكرێتەوە. هەندێك پێی دەڵێن وەلی ، هەر وەك لە زمانی زۆرێك لە میسریەكاندا هەر وایە

قال ابن مانع : " مراده بالسيد : ما يعتقده الجهال في بعض الأشخاص الدجالين والمشعوذين الذي يلبسون على العوام بأنهم أهل كرامات وتصرف في الأمور ، وأنه ينبغي الالتجاء إليهم

ودعاؤهم والتوسل بهم إلى الله ، فالعامة يُسمون هذا الدجال سيداً ، وهذا معروف معلوم ، وهذا مراد الشيخ رحمه الله "

**واتە: مەبەستی دانەر لە سەیید ئەوەیە كە نەفامەكان عەقیدەیان هەیە بە هەندێك كەسی دەججال و درۆزن و دەستبڕ، ئەوانەی كە خەڵكی عەوام فریو دەدەن كە گوایە خۆیان خاوەنی كەڕاماتن و دەتوانن كاروبار و پێویستیەكانی خەڵكی جێ بەجێ بكەن، پێویستە خەڵكی پەنا بەوان ببەن و داوایان لێ بكەن و بە هۆی ئەوانەوە خۆیان لە خودا نزیك بكەنەوە. خەڵكی عەوام بەم دەجالانە دەڵێن سەید، ئەمەش ڕوون و ئاشكرایە و لە ناو خەڵكیدا دەبینرێت ، مەبەستی شێخ محمدیش ئەمەیە بەڕەحمەت بێت .**

# بڕگەی پێنجەم : ناكۆكی خەڵكی لە بارەی مەعنای پەرستراویەوە

والْمرَادُ مِنْ هَذِهِ الْكَلِمَةِ مَعْنَاهَا لاَ مُجَرَّدُ لَفْظِهَا . وَالْكُفَّارُ الْجُهَّالُ يَعْلَمُونَ أَنَّ مُرَادَ النَّبِيِّ صلى الله عليه وسلم بِهَذِهِ الْكَلِمَةِ هُوَ إِفْرَادُ اللَّهِ تَعَالَى بِالتَعَلُّقِ ، وَالْكُفْرُ بِمَا يُعْبَدُ مِنْ دُونِ الله ، وَالْبَرَاءَةُ مِنْهُ ؛ فَإِنَّهُ لَمَّا قَالَ لَهُمْ : (قُولُوا : لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ) قالوا: {أَجَعَلَ الآَلِهَةَ إِلَهاً وَاحِداً إِنَّ هَذَا لَشَيْءٌ عُجَابٌ} ص

**ئەوەی كە داوا كراوە لە گوتنی ( لا إله إلا الله ).دا قبوڵكردنی مەعناكەیەتی نەك تەنها گوتنی بەدەم.**

**كافرە جاهیلەكان دەیانزانی كە مەبەستی پێغەمبەر ﷺ بەم كەلیمەیە ئەوەیە : كە ﷻ بە تەنها دابنرێت لەوەدا كە ئینسان لە هەموو ڕوویەكەوە پەیوەست بێت تەنها بە خوداوە. لەگەڵ ئەوەشدا دەبێت كافر بێت بە پەرستنی هەرچییەك كە هەر جۆرە پەرستنێكی بۆ بكرێت جگە لە ﷻ . دەبێت خۆشی لێ بەری بكات.**

**چونكە كاتێ بەوانی گوت بڵێن :( لا إله إلا الله ) گوتیان: ئایە ئەم هەموو پەرستراوانەی كەم كردەوە و كردنی بە یەك پەرستراو كە تەنها ﷻ یە، بە ڕاستی ئەم گوتەیە شتێكی عەجیبە.**

فَإِذَا عَرَفْتَ أَنَّ جُهَّالَ الْكُفَّارِ يَعْرِفُونَ ذَلِكَ فَالْعَجَبُ مِمَّنْ يَدَّعِي الإِسْلاَمَ وَهُوَ لا يَعْرِفُ مِنْ تَفْسِيرِ هَذِهِ الْكَلِمَةِ مَا عَرَف جُهَّالُ الْكُفَّارِ، بَلْ يَظُنُّ أَنَّ ذَلِكَ هُوَ التَّلَفُّظُ بِحُرُوفِهَا مِنْ غَيْرِ اعْتِقَادِ الْقَلْبِ لِشَيْءٍ مِنَ الْمَعَانِي

جا كە زانیت كافرە نەفامەكان ئەمەیان دەزانی، عەجیب ئەوەیە كە كەسانێك دیعایەی ئیسلامەتی بۆ خۆیان دەكەن ، بەڵام تەفسیری ئەم كەلیمەیە نازانن، بەو جۆرەی كە كافرە نەفامەكان دەیانزانی. سەرەڕای ئەوەش وا گومان دەبەن و وەها دەزانن كە ئیسلامەتی هەر ئەوەیە كە حەرفەكانی ( لا إله إلا الله ) بەدەم بگوترێت ، بە بێ ئەوەی لە دڵەوە باوەڕی بە هیچ كام لە مەعناكانی ببێت.

وَالْحَاذِقُ مِنْهُمْ يَظُنُّ أَنَّ مَعْنَاهَا : لا يَخْلقُ ، وَلا يَرْزُقُ ، وَلا يُدَبِّرُ إِلاَّ اللَّهُ .
فَلا خَيْرَ فِي رَجُلٍ جُهَّالُ الْكُفَّارِ أعْلَمُ مِنْهُ بِمَعَاني لا إِلَهَ إِلا اللَّه

كامەیان شارەزا و زیرەكە گومانی وایە كە ( **لا إله إلا الله** ) واتە هیچ كەس ڕزق نادات جگە لە ﷲ ، هیچ كەس كاروبارەكان بەڕێوە نابات جگە لە ﷲ

جا كەواتە هیچ جۆرە خەیرێك لە پیاوێكدا نییە كە كافرە جاهیلەكان لەبارەی لە واتای ( **لا إله إلا الله** ) وە لەو كەسە شارەزاتر و زاناتر بن.

دانەر چەند جۆرێكی لە خەڵكی باس كردووە :

جۆری یەكەم : مەعنای ئەو كەلیمەیە دەزانێت بەڵام كاری پێ ناكات، پەرستنەكانی تەنها بۆ ﷲ ئەنجام نادات ، ئەوانە موشریكن .

جۆری دووەم : عەقیدەی وایە كە مەعنای وتنی ( **لا إله إلا الله** ) تەنها ئەوەیە كە بەدەم بیڵێت و هیچی تر. هەر كەس بڵێ ( **لا إله إلا الله** ) لای ئەوان موسڵمانە، ئەو حەدیسە دەكەن بە بەڵگە (من قال لا إله إلا الله دخل الجنة) جا ئەگەر بە قسەی ئەوان بێت هەركەس هەر بە دەم بیڵێت و كاری پێ نەكات، موسڵمان بێت، ئەوا مونافیقەكانیش موسڵمانن، چونكە مونافیقەكانیش، دەیانگوت بەڵام خودا دەفەرموێ : {إِنَّ الْمُنَافِقِينَ فِي اَلدَّرْكِ الْأَسْفَلِ مِنْ النَّارِ} النساء ١٤٥
واتە : مونافیقەكان لە پلەی هەرە خوارەوەن لە ئاگری جەهەنەمدا.

جۆری سێیەم: زۆرینەی خەڵكی دەگرێتەوە كە وا دەزانن كە مەعنای پەرستراوی هەمان مەعنای پەروەردگاری هەیە ، ئەمەش ئەشعەریەكان و جەهمیەكان و ڕافیزە و قەبرپەرستان و صۆفیەكان دەگرێتەوە.

ڕەددی ئەمانیش بەمجۆرەیە :

١. عەرەبە موشریكەكان دانیان بەوەدا دەنا كە تەنها ﷲ پەروەردگارە ، بەڵام دانیان بەوەدا نەدەنا كە تەنها ئەو پەرستراو بێت .

٢. ﴿قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ ١ مَلِكِ ٱلنَّاسِ ٢ إِلَٰهِ ٱلنَّاسِ ٣﴾ الناس

ئەگەر (ڕەب) و (ئیلاه) یەك شت بوونایە دووبارە نەدەكرانەوە .

٣. زانایانی زمانناسی عەرەبی یەكدەنگن لە سەر ئەوەی كە (ڕەب) و (ئیلاه) دوو مەعنای جودایان هەیە .

٤. ئەهلی تەفسیریش هەر وا دەڵێن .

# بڕگەی شەشەم : دڵخۆش بوون بە ناسینی تەوحید و ناسینی پێچەوانەکەی بەجوانی

إِذَا عَرَفْتَ مَا ذَكَرتُ لَكَ مَعْرِفَةَ قَلْبٍ ،
وَعَرَفْتَ الشِّرْكَ بِاللَّهِ الَّذِي قَالَ اللَّهُ فِيهِ
{ إِنَّ اللَّهَ لا يَغْفِرُ أَنْ يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَنْ يَشَاءُ } النساء ٤٨
وَعَرَفْتَ دِينَ اللَّهِ الَّذِي أُرسلَ بِه الرُّسُلَ مِنْ أَوَّلِهِمْ إِلَى آخِرِهِمْ ، الَّذِي لا يَقْبَلُ اللَّهُ مِنْ أحَدٍ سِوَاهُ ، وَعَرَفْتَ مَا أصْبَحَ غَالِبَ النَّاسِ عَلَيْهِ مِنَ الْجَهْلِ بِهَذَا أَفَادَكَ فَائِدَتَيْنِ :
الأُولَى : الْفَرَحُ بِفَضْلِ اللَّهِ وَرَحْمَتِهِ ، كَمَا قَالَ اللهُ تَعَالَى
﴿ قُلْ بِفَضْلِ ٱللَّهِ وَبِرَحْمَتِهِۦ فَبِذَٰلِكَ فَلْيَفْرَحُواْ هُوَ خَيْرٌ مِّمَّا يَجْمَعُونَ ﴿٥٨﴾ ﴾ يونس
وَأَفَادَكَ أَيْضاً : الْخَوْفَ الْعَظِيمَ .

**مادام تۆ ئەم شتانەت زانی:**

**<u>یەکەم</u> : ئەوەی کە بۆتم باس کرد لە کانگای دڵەوە زانیت ، زانینێکی ڕاست و دروست ( واتە : لە دڵەوە زانیت و بە ڕاستت زانی لە دڵیشەوە کارت پێکرد واتە : شەرتەکانی ( لا إله إلا الله ) ت لە دڵەوە لە خۆتا هێنایە دی .**

**<u>دووەم</u> : شیرکیشت ناسی ،ئەوەی کە خودا لە بارەیەوە فەرمویەتی :**
{إِنَّ اللَّهَ لا يَغْفِرُ أَنْ يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَنْ يَشَاءُ}

**واتە (بە تەئكید خودا لەوە خۆش نابێت كە شەریكی بۆ دابنرێت ، جگە لەوە لە هەر گوناهێكی دیكە خۆش دەبێت ، لە هەر كەسێك كە خۆی بیەوێت)**

**واتە : ئەگەر هەر ئینسانێ لەسەر شیركی گەورە بمرێت ، نە خودا لێی خۆش دەبێت و نە دەیخاتە بەهەشتەوە.**

**بەڵام شیركی بچوك : قەولی ڕاجیح ئەوەیە ئەگەر ئینسان لە سەر شیركی بچوك بمرێت ، ئەوا خودا لێی خۆش نابێت ، چونكە شیركی بچوك پلەیەكە دەكەوێتە نێوان شیركی گەورە و تاوانە گەورەكانەوە ، بەڵام موسڵمانی پێ كافر نابێت و بە هەمیشەیی لە ئاگردا نامێنێتەوە .**

**سێیەم : دینی خوداشت ناسی ئەو دینەی كە بە پێغەمبەراندا ڕەوانەی كردووە لە یەكەم ڕەسولەوە كە نوح بووە تا ئەخیرەكەیان كە محمد بووە ﷺ كە جگە لەو دینە ، خودا لە هیچ كەسی دیكە قبوڵ ناكات دینێكی دیكەی ببێت .**

**چوارەم : زانیشت كە زۆربەی خەڵكی لەو بارەوە نەزان و نەفامن.**

**( واتە نازانن تەوحید چییە و ناشزانن شیرك چییە ، واتە بە هەڵە حاڵی بوون لە تەوحید و لە شیرك.**

**ئەمەش دوو سوود و پەندی گەورەی لێ وەردەگریت :**

**یەكەمیان : واجبە دڵخۆشبوون بە فەزڵ و بەخششی خودا چونكە :**

**١. تۆ ئیسلامت ناسی ، ناسینێكی ڕاست و دروست ، پێچەوانەكەیشت ناسی كە شیركە ، چونكە تۆ زانستێكی گەورەت دەستكەوتووە لەبارەی گەورەترین شتەوە كە ئەویش تەوحیدە .**

**٢. چونكە تۆ سەلامەت بوویت لە دەست عەقیدە و بیروباوەڕی پوچ و بەتاڵ ، ئەمەش ئەوپەڕی دڵخۆشی دەوێت.**

**٣. تۆ بەوانە بوویت بە یەكێ لە ئەهلی سوننەت و جەماعەت ، و ئەهلی تەوحید و نەبوویت بە یەكێ لە ئەهلی شیرك و قەبرپەرستان ، وەك خودا فەرمویەتی:**

{قُلْ بِفَضْلِ اللَّهِ وَبِرَحْمَتِهِ فَبِذَلِكَ فَلْيَفْرَحُوا هُوَ خَيْرٌ مِمَّا يَجْمَعُونَ} یونس ٥٨

**واتە :( بڵێ با ئیمانداران تەنها بەم بەخششەی خودا دڵخۆش و شادمان بن كە قورئانە و مایەی هیدایەتە بۆ گوتەی حەق و كرداری چاكە و سەرەنجامەكەشی ڕەحمەتە . دەی با تەنها بەمە دڵخۆش بن. نەك بە شتی دیكە ئەمە باشترە لەو ماڵ و سامانەی كە كافران و موشریكان كۆی دەكەنەوە)**

**دووەمیان ئەوەیە كە زۆر بترسیت لە شیرك كە تێی بكەویت و بە خۆت نەزانیت (واتە بە عیلم و بە كار و كردەوەكانت مەغرور نەبیت و هەمیشە لە هەوڵدا بیت بۆ فێربوونی زیادتر لە بارەی تەوحیدەوە و خۆ پاراستن لە ئەنواعی شیرك .**

**چونكە ئێمە لە پێغەمبەر ئیبراهیم (علیه السلام) زیاتر نین كە هەمیشە لە شیرك دەترسا و دەیفەرموو :** وَاجْنُبْنِي وَبَنِيَّ أَنْ نَعْبُدَ الْأَصْنَامَ **(٣٥) إبراهيم**

**( واتە : خودایە من و نەوەكانم لەوە بە دوور بگرە كە بت بپەرستین یان غەیری تۆ بپەرستین ).**

(شهاب الدين القرافي) **دەڵێت** ( الْقَاعِدَةَ الشَّرْعِيَّةَ دَلَّتْ عَلَى أَنَّ كُلَّ جَهْلٍ يُمْكِنُ الْمُكَلَّفَ دَفْعُهُ لَا يَكُونُ حُجَّةً لِلْجَاهِلِ فَإِنَّ اللَّهَ تَعَالَى بَعَثَ رُسُلَهُ إلَى خَلْقِهِ بِرَسَائِلِهِ وَأَوْجَبَ عَلَيْهِمْ كَافَّةً أَنْ يُعَلِّمُوهَا ثُمَّ يَعْمَلُوا بِهَا فَالْعِلْمُ وَالْعَمَلُ بِهَا وَاجِبَانِ فَمَنْ تَرَكَ التَّعَلُّمَ وَالْعَمَلَ وَبَقِيَ جَاهِلًا فَقَدْ عَصَى مَعْصِيَتَيْنِ لِتَرْكِهِ وَاجِبَيْنِ ) (كتاب الفروق)

**واتە:﴿ ئەم قاعیدە شەرعیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە هەر نەزانینێك ، هەر كەسێكی موكەلەف (واتە بالغ و عاقل)، توانای هەبوو ئەو نەزانینەی لەسەر خۆی لابدات ، ئەوا ئەو نەزانینە نابێتە عوزر و بیانوو بۆ هیچ نەزانێك ، چونكە ﷲ نێردراوەكانی خۆی بە نامەكانیەوە ناردووە بۆ ناو خەڵكی. واجبیشی كردووە لەسەریان كە خۆیان فێری ئەو نامانە بكەن و پاشان كاری پێ بكەن. كەواتە زانست و كاركردن بەو زانستە دوو واجبی سەرشانی ئینسانن. جا هەر كەسێك واز بێنێت لە خۆ فێركردن واز بێنێت لە كاركردن بەو عیلمە، و مایەوە بە نەفامی ئەوە دوو كەڕەت بێفەرمانی خودای كردووە ، چونكە وازی لە دوو واجب هێناوە﴾**

# بڕگەی حەوتەم :ئایا جەهل یان تەئویل لە شیركی گەورەدا عوزرە یا عوزر نیە؟

فَإِنَّكَ إِذَا عَرَفْتَ أَنَّ الإِنْسَانَ يكْفُرُ بِكَلمَةٍ يُخْرِجُهَا مِنْ لِسَانِهِ ،
وَقَدْ يَقُولُهَا وَهُوَ جَاهِلٌ فَلا يُعْذَرُ بِالْجَهْلِ ،
وَقَدْ يَقُولُهَا وَهُوَ يَظُنُّ أَنَّهَا تُقَرِّبُهُ إِلىَ اللَّهِ كَمَا ظَنَّ الْمشركون ،
خُصُوصاً إِنْ أَلْهَمكَ اللَّهُ مَا قَصَّ عَنْ قَوْمِ مُوسَى مَع صَلاحِهِمْ وَعِلْمِهِمْ أَنَّهُمْ أتَوْهُ قَائِلِينَ
{ اجْعَلْ لَنَا إِلَهاً كَمَا لَهُمْ آلِهَةٌ } الأعراف : ١٣٨

**چونكە تۆ كاتێك كە زانیت ئینسان دەبێت بەكافر بە تەنها یەك كەلیمە كە لە زمانی دەردەچێت بیٚ ئەوەی لە دڵەوە باوەڕی بەو كەلیمەیە ببێت .**

(وقد يقولها وهو جاهل فلا يعذر بالجهل)

**هەندێك جار ئەو قصەیە دەكات ، كە جاهیلە و نەزانە ، بەڵام هیچ عوزرێكی بۆ ناهێنرێتەوە بەوەی كە نەزان بووە .**

وقد يقولها وهو يظن أنها تقربه إلى الله تعالى كما ظن المشركون

**وە هەندێك جار دەیڵێت و وا دەزانێت ئەو كەلیمەیە لە خودای نزیك دەكاتەوە . هەروەك موشریكەكان وا گومانیان دەبرد بە شەریك دانان بۆ خودا، لە خودا نزیك دەبنەوە بەوەی كە شەریكیان بۆ داناوە.**

به تایبەت ئەگەر خودا ئیلهامی ئەوەی پێدا بیت لەبارەی قەومی موساوە ، سەرەڕای ئەوەی كە پیاوچاك بوون و خاوەنی عیلمی شەرعی بوون ، ئەوە بوو كاتێ تێپەڕین بەلای قەومێكدا كە بتیان دەپەرست هاتن بۆ لای موسا و گوتیان : {اجْعَلْ لَنَا إِلَهاً كَمَا لَهُمْ آلِهَةٌ} الأعراف : ١٣٨واتە (ئەی موسا پەرستراوێكمان بۆ دابنێ هەر وەك چۆن ئەو قەومەش پەرستراوێكیان هەیە )

| |
|---|
| فَحِينَئِذٍ يَعْظُمُ خَوْفُكَ ، وَحِرْصُكَ عَلَى مَا يُخَلِّصُكَ مِنْ هَذَا وَأَمْثَالِهِ. |

جا كە ئەوانەت زانی ئەو كاتە ترسەكەت گەورە دەبێت و ئەوجا سووردەبیت لەسەر ئەوەی كە فێری عیلمێك ببیت و كردەوەیەك فێر ببیت كە لەم جۆرە كارانە و هاوشێوەكانی نەجاتت بدات ، نەوەك تێی بكەویت و بە خۆت نەزانیت ، چونكە ئەو كاتە هیچ عوزرێكت نابێت .

یەكێ لە هۆیەكانی نەجات بوون

١. ئەوەیە كە وەك حوزەیفە : بگەڕێیت و خۆت فێری عیلمی شەرعی بكەیت

٢. یەكی تر ئەوەیە داوا لە خودا بكەیت ، كە خودا هیدایەتت بدات و هەمیشە بترسیت لە شیرك ، هەر وەك ئیبڕاهیم فەرمووی خودایە من و نەوەكانم دوور بگرە لەوەی كە بت بپەرستین یان غەیری تۆ بپەرستین .

# بڕگەی هەشتەم : هەموو پێغەمبەرێك، خودا دوژمنی بۆ داناون كە ئەو دوژمنانە بەڵگەی خۆیان پێیە بۆ دژایەتی كردنی پێغەمبەران و شوێنكەوتوەكانیان

وَاعْلَمْ أَنَّ اللَّهَ سُبْحَانهُ مِنْ حِكْمَتِهِ لَمْ يَبْعَثْ نَبِيّاً بِهَذَا التَوْحِيدِ إِلاَّ جَعلَ لَهُ أعْدَاءً كَمَا اللهُ قَالَ تَعَالَى { وَكَذَلِكَ جَعَلْنَا لِكُلِّ نَبِيٍّ عَدُوًّا شَيَاطِينَ الإِنسِ وَالْجِنِّ يُوحِي بَعْضُهُمْ إِلَى بَعْضٍ زُخْرُفَ الْقَوْلِ غُرُورًا ] الأنعام ١١٢

**بزانە ئەی فێرخوازی عیلمی شەرعی، كە خودا جۆرێك لە حیكمەتەكانی كە تاقیكردنەوەی عەبدەكانیەتی، ئەوەیە كە هەر پێغەمبەرێكی ناردبێت بەم تەوحیدەوە كە پەرستنی الله یە بەتەنها، هەر لە نوحەوە هەتا پێغەمبەری خۆمان ﷺ**

**(إلا جعل له أعداء) ئیلا خودا دوژمنی داناوە بۆ ئەو پێغەمبەرانە و بۆ شوێنكەوتوانیان ، بە دەم وبە دەست و بە پارە و پول و سامانیان بە هەموو جۆرێك دژایەتی بانگەوازی تەوحید دەكەن كە بانگەوازی تەواوی پێغەمبەرانە ئەمەش بۆ هەموو كات و شوێنێكە ، بە بێ ڕاوەستان.**

**خودای بڵند دەفەرموێ:** ﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَا لِكُلِّ نَبِيٍّ عَدُوًّا شَيَٰطِينَ ٱلْإِنسِ وَٱلْجِنِّ يُوحِى بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ زُخْرُفَ ٱلْقَوْلِ غُرُورًا ۚ وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ مَا فَعَلُوهُ ۖ فَذَرْهُمْ وَمَا يَفْتَرُونَ ﴿١١٢﴾ ﴾ الأنعام

واته :( هەر بەو جۆرە كە دوژمنمان بۆ تۆ داناوە ، بۆ هەموو پێغەمبەرێكیش دوژمنمان داناوە ، ئەوانەش شەیتانەكانن ئەوانەن كە لە ڕەحمی خوداوە دوورن، جا ئینسان بن یا جنی. هەندێكیان هەندێكی دیكەیان فێری گوتەی بە ڕوكەش ڕازاوە دەكەن بۆ ئەوەی یەكتر فریو بدەن و لە خشتەبەرن، ئەگەر پەروەردگارت بیویستایە نەیدەهێشت دوژمنایەتی ئیمانداران بكەن و ئەو گوتە ڕازاوە و بەناوەڕۆك گەندەلانە بلاو بكەنەوە. دەی تۆش وازیان لێ بێنە لەگەڵ ئەوەشدا واز بێنە لە هەموو شتانەی كە ئەوان هەڵیان بەستووە.
(واتە وازبێنە لە گشت گوتە و بەرنامە و نوسراوەكانیان )

وَقَدْ يكُونُ لأَعْدَاءِ التَّوْحِيدِ عُلُومٌ كَثِيرَةٌ وكتبٌ وَحُجَجٌ ، كَمَا قَالَ تَعَالَى
{ فَلَمَّا جَاءَتْهُمْ رُسُلُهُمْ بِالْبَيِّنَاتِ فَرِحُوا بِمَا عِنْدَهُمْ مِنْ الْعِلْمِ } الغافر ٨٣.

جا لەوانەیە دوژمنانی تەوحید هەبێت زانیاری و شارەزایی زۆریان ببێت.
(وكتب وحجج) كتێب و نوسراوی زۆر دەنوسن و بلاوی دەكەنەوە بۆ لەخشتە بردنی خەڵكی وەك دەستگاكانی ڕاگەیاندن . دیارە بەڵگەشیان پێیە بە حسابی خۆیان كە بیسەلمێنن كە تەوحید حەق نییە و ئەو شیركەی خۆیان حەقە.
هەروەك خودا فەرمویەتی :
{فَلَمَّا جَاءَتْهُمْ رُسُلُهُمْ بِالْبَيِّنَاتِ فَرِحُوا بِمَا عِنْدَهُمْ مِنَ الْعِلْمِ} الغافر ٨٣
واتە :﴿ كاتێ پێغەمبەرەكانیان هاتن بۆ لایان بە بەڵگەی ئاشكرا و ڕۆشنەوە، ئەو كافرانە قبوڵیان نەكرد و خۆیان دڵخۆش كرد بەو زانستەی كە لایان بوو بۆ دژایەتی كردنی پێغەمبەرەكانیان ﴾

## بڕگەی نۆ : بۆ بەرەنگار بوونەوەی دوژمنانی دین خۆ چەكدار كردن بە زانستی شەرعی ، زەرورەتە .

إذا عَرَفْتَ ذَلِكَ ، وَعَرَفْتَ أنَّ الطَّرِيقَ إِلَى اللَّهِ لاَبُدَّ لَهُ مِنْ أعْدَاءٍ قَاعِدِينَ عَلَيْهِ ، أَهْلِ فَصَاحَةٍ ، وَعِلْمٍ ، وَحُجَجٍ فَالْوَاجِبُ عَلَيْكَ أَنْ تَعْلَمَ مِنْ دِينِ اللَّهِ مَا يَصِيرُ سِلاحًا لك تُقَاتِلُ بِهِ هَؤُلاءِ الشَّيَاطِينَ الَّذِينَ قَالَ إِمَامُهُمْ ، وَمُقَدَّمُهُمْ لِربكَ :{لأَقْعُدَنَّ لَهُمْ صِرَاطَكَ الْمُسْتَقِيمَ ثُمَّ لآتِيَنَّهُمْ مِنْ بَيْنِ أَيْدِيهِمْ وَمِنْ خَلْفِهِمْ وَعَنْ أَيْمَانِهِمْ وَعَنْ شَمَائِلِهِمْ وَلا تَجِدُ أَكْثَرَهُمْ شَاكِرِينَ} الأعراف : ١٦-١٧ وَلَكِنْ إذا أَقْبَلْتَ على اللَّهِ ، وَأَصْغَيْتَ إِلَى حُجَجِ اللَّهِ ، وَبَيِّنَاتِهِ فَلا تَخَفْ ، وَلاَ تَحْزَنْ {إِنَّ كَيْدَ الشَّيْطَانِ كَانَ ضَعِيفاً}.

{إذا عرفت ذلك}

مادام ئەوەشت زانی كە پێغەمبەران و شوێنكەوتوانیان هەمیشە دوژمندارن

{ وعرفت أن الطريق إلى الله لا بد له من أعداء }

وە زانیشت كە ڕێگای خودا و دینی خودا هەمیشە دوژمنگەلێكی هەیە .

{قاعدين عليه } هەمیشە ئەو دوژمنانە لەسەر ئەو ڕێگایە دانیشتوون، نە هەڵدەستن و نە وازدەهێنن بۆ پیلانگێڕان بە هەموو جۆرێك دژی بانگەوازەكەیان و ڕێبازەكەیان كە تەوحیدە.

{أهل فصاحة وعلم وحجج }

كە خاوەنی ڕەوانبێژی و زمانی لوسن. زانستێكی ناحەقیان پێیە، یان فەلسەفەیە یان خەوە یان غەڵەت حاڵی بوونە لە بەڵگەكانی قورئان و سوننەت .

(فَالْوَاجِبُ عَلَيْكَ أَنْ تَعْلَمَ مِنْ دِينِ اللَّهِ مَا يَصِيرُ سِلاحًا لك تُقَاتِلُ بِهِ هَؤُلاءِ الشَّيَاطِينَ)

**واجبە لەسەرت كە فێری دینی خودا ببیت ئەوەندەی كە بۆت ببێت بە سیلاحێك كە بەو زانستە بەرانبەر شەیتانەكان بجەنگیت .**

**ئەو بەچكە شەیتانانەی كە ئیمام و پێشەواكەیان كە ئیبلیسە بە پەروەردگاری گوت :**{لأَقْعُدَنَّ لَهُمْ صِرَاطَكَ الْمُسْتَقِيمَ ثُمَّ لآتِيَنَّهُمْ مِنْ بَيْنِ أَيْدِيهِمْ وَمِنْ خَلْفِهِمْ وَعَنْ أَيْمَانِهِمْ وَعَنْ شَمَائِلِهِمْ ] **الأعراف ١٦**

**واتە :( ئەی خودایە سوێند بە تۆ كە منت لادا لە ڕێگای ڕاست ، دەبێت دابنیشم بۆیان لەسەر ڕێگا ڕاست و ڕەوانەكەت ، بۆ ئەوەی لایان بدەم لەسەری ، پاشان دێم بۆیان لەبەردەمیانەوە ، وە لە دوایانەوە ، وە لە ڕاستیانەوە وە لە چەپیانەوە ، واتە لە هەموو لایەكەوە ، بەڵام نەیگوت لە سەرویانەوە ، چونكە ناتوانێت ڕێگای ڕەحمەتی خودایان لێبگرێت).**

**(ابن عباس) لەبارەی تەفسیری ئەم ئایەتەوە دەڵێت :**

**لە بەردەمیانەوە ، واتە : لەبارەی ئاخیرەتەوە گومانیان بۆ دروست دەكەم .**

**لەدوایانەوە ، واتە : دونیایان لەبەرچاو دەڕازێنمەوە .**

**لە ڕاستیانەوە ، واتە لە كردەوە چاكەكان ساردیان دەكەمەوە.**

**لە چەپیانەوە ، واتە هەوڵ دەدەم كردەوەی خراپیان پێ ئەنجام بدەم.**

{ وَلا تَجِدُ أَكْثَرَهُمْ شَاكِرِينَ} **واتە : زۆربەی عەبدەكانت دەبینیتەوە كە شوكری تۆ ناكەن ، واتە شەریكت بۆ دادەنێن.**

**مادام ئەوە ڕێگاكەت بێت و ئەوانەش دوژمنەكانت بن ، كە دەبینیت هەموو تواناكانیان خستۆتە گەڕ بۆ دوژمنایەتی كردنی دینەكەت و ئەهلی دینەكەت.**

**كەواتە واجبە لەسەرت كە هەموو توانای خۆت بخەیتە گەڕ بۆ پوچەڵكردنەوەی پیلانەكانیان ، هەتا بیسەلمێنیت كە بە ڕاستی عەبدی خودایت**

{ولكن إذا أقبلت على الله وأصغيت إلى حججه وبيناته فلا تخف ولا تحزن}

**بەڵام دڵنیابە و مەترسە ، چونكە یەكەم ئەگەر دوو شەرتت لە خۆتا بەدی هێنا :**

**شەرتی یەکەم : ئەگەر بە دڵ و بە جەستە ڕووت کردە خودا و تەنها پشتت بە خودا بەست .**

**شەرتی دووەم : لەگەڵ ئەوەشدا هەوڵت دا بۆ فێربوونی عیلمی شەرعی و بە جوانی گوێت گرت لە بەڵگەکانی خودا و ڕوونکردنەوەکانی لە قورئان و سوننەتدا.**

**دووەم : مەشترسە چونکە** {إِنَّ كَيْدَ الشَّيْطَانِ كَانَ ضَعِيفاً} **بە تەئکید پیلانی هەموو شەیتانەکان و بەچکەکانیان یەکجار لاوازە، لە بەرانبەر پیلانی خودادا، چونکە ئەگەر تۆ لەگەڵ خودا بیت دڵنیا دەبیت کە خودات لەگەڵدایە و خوداش وەعدی داوە کە سەربازەکانی خۆی سەردەخات وەك فەرمویەتی :**

{وَإِنَّ جُنْدَنَا لَهُمُ الْغَالِبُونَ} **الصافات**

**ئەم بڕگەیە ڕوونی دەکاتەوە کە فێربوونی عیلمی شەرعی واجبە لەسەر هەموو موسڵمانێك، بەتایبەت عیلمی تەوحید و عەقیدە، بۆ ئەوەی بتوانێت ڕەددی دوژمنانی دین و ئەهلی بیدعە بداتەوە.**

# بڕگەی دەهەم : ئەهلی تەوحید هەمیشە سەرکەوتووە با عەوامیش بێت

وَالْعَامِّيُّ مِنَ الْمُوَحّدِينَ يَغْلِبُ الأَلْفَ مِنْ عُلَمَاءِ هَؤُلاءِ الْمُشْرِكِين،
كَمَا قَالَ تَعَالَى{ وَإِنَّ جُنْدَنَا لَهُمُ الْغَالِبُونَ } الصافات ١٧٣،
فَجُنْدُ اللَّهِ هُمُ الْغَالِبُونَ بِالْحُجَّةِ وَاللِّسَانِ كَمَا هُمُ الْغَالِبُونَ بِالسَّيْفِ وَالسِّنَانِ ،
وإِنَّمَا الْخَوْفُ عَلَى الْمُوَحِّدِ الَّذِي يَسْلُكُ الطَّرِيقَ وَلَيْسَ مَعَهُ سِلاحٌ

**هەرکەسێکی عەوام کە ئەهلی تەوحید بێت زاڵ دەبێت بەسەر هەزار زانای موشریکدا هەروەك خودای بڵند فەرمویەتی : { وَإِنَّ جُنْدَنَا لَهُمُ الْغَالِبُونَ }**
**واتە :﴿ بە تەئکید سەربازەکانی ئێمە سەرکەوتوون ﴾ کەواتە سەربازەکانی ﷲ سەرکەوتوون بە بەڵگە و بە زمان، هەروەك سەرکەوتوون بە شمشێر و بە ڕمان .**
**مەترسی دۆڕانیش تەنها لەسەر ئەو یەکخوداپەرستەیە، کە دەکەوێتە ڕێگا و هیچ سیلاحێکی پێ نەبێت.**
**واتە : زانستی پێ نەبێت بۆ بەرپەرچدانەوەی گومانی گومڕایان .**
**کەواتە : موسڵمانی عەوام کە چەکی زانستی پێ نەبێت نابێت بڕواتە جەنگی وتووێژ و موناقەشەوە بەرانبەر گومڕایان، و خۆشی توشی دۆڕان بکات.**
**(جند الله) مەبەست لە سەربازەکانی ﷲ ئەوانەن کە خودا هەرچیەکی واجب کردبێت لەسەریان جێ بە جێیان کردووە ، کاریان بەو عیلمە کردووە کە خودا فێری کردوون ، گوێیان گرتووە بۆ بەڵگەکانی خودا ، بە عەزیمەت و ئیخلاصەوە ، بانگەوازی خەڵکیش دەکەن بۆ ئەو ڕێگایە .**

# برگەی یازدە : قورئان پڕە لەو بەڵگانەی کە ڕەددی گومڕایی دەداتەوە.

وَقَدْ مَنَّ اللَّهُ عَلَيْنَا بِكِتَابِهِ الَّذِي جَعَلَهُ {تِبْيَاناً لِكُلِّ شَيْءٍ وَهُدىً وَرَحْمَةً وَبُشْرَى لِلْمُسْلِمِينَ} النحل : ٨٩. فَلا يَأْتِي صَاحِبُ بَاطِلٍ بِحُجَّةٍ إِلاَّ وَفِي الْقُرْآنِ مَا يَنْقُضُهَا ، وَيُبَيِّنُ بُطْلانَهَا، كَمَا قَالَ تَعَالَى { وَلا يَأْتُونَكَ بِمَثَلٍ إِلاَّ جِئْنَاكَ بِالْحَقِّ وَأَحْسَنَ تَفْسِيرًا } الفرقان ٣٣

**ئەڵبەتە خودا ئەو منەتەی کردووە بە سەرماندا بە قورئانەکەی کە کردوویەتی بە ﴿تِبْيَاناً لِكُلِّ شَيْءٍ﴾ ڕوونکەرەوەی هەموو شتێ واتە ئەو شتانەی کە ئینسان پێویستی پێیەتی لە ئەمر و نەهی و حەڵاڵ و حەرام و حدود و ئەحکام .**

**﴿وهدى﴾ئەو قورئانە هیدایەتە ڕێنیشانیە بۆ عیلمی بە سوود و کردەوەی چاکە.**

**﴿ورحمة ﴾ ئەنجامەکەشی ڕەحمەتە چونکە پاداشتی دونیا و ئاخیرەتی تێدایە**

**﴿وَبُشْرَى لِلْمُسْلِمِينَ ﴾ ئەم قورئانە مژدە و مزگێنی یە بۆ ئەو کەسانەی کە کاری پێ دەکەن و دەیکەنە بەرنامەیان کە مژدەیان لێ بێت خودا سەرفرازی دونیا و ئاخیرەتیان دەکات.**

﴿فلا يأتي صاحب باطل بحجة إلا وفي القرآن ما ينقضها ويبين بطلانها﴾

**هەرکەسێك کە خاوەنی هەر ڕێبازێکی ناحەق بێت، هەر بەڵگەیەك بێنێتەوە بۆ خۆی ئیلا لە قورئاندا یان لە سوننەتدا ڕەددی ئەوەی تێدایە کە بەڵگەکەی پوچ بکاتەوە ڕوونی دەکاتەوە کە بەڵگەی ئەو گومڕایە ناحەقە .**

**﴿ وَلا يَأْتُونَكَ بِمَثَلٍ ﴾ ئەو گومڕایانە هەر جۆرە بەڵگەیەك کە دەیهێننەوە جا هەر جۆرە قیاسێ بێت ، یان هەر جۆرە گومانێك بێت**

{إِلاَّ جِئْنَاكَ بِالْحَقِّ وَأَحْسَنَ تَفْسِيرا}

**ئیلا خودا لەبەرانبەر ئەوەدا حەق و ڕاستی تەواوی داوە پێمان کە ڕەددی ئەوان دەداتەوە . وە جوانترین ڕوونکردنەوە و تەفصیلاتی داوە پێمان**

قَالَ بَعْضُ الْمُفَسِّرِينَ : هَذِهِ الآيَةُ عَامَّةٌ في كُلِّ حُجَّةٍ يَأْتي بِهَا أَهْلُ الْبَاطِلِ إِلَى يَوْم الْقِيَامَةِ

**هەندێك لە تەفسیرناسان گوتویانە ئەم ئایەتە (واتە ئایەتی٣٣ی فورقان)، هەموو بەڵگەیەك دەگرێتەوە كە ئەهلی باتڵ دەیكەنە بەڵگەی دەستیان ، هەتا ڕۆژی قیامەت.**

# بەشی دووەم لە کتێبی ( کشف الشبهات )

**دەکرێت بە دوو بەشەوە**

**بەشی یەکەم وەڵامی گشتگیر (کە ئایەتی حەوتی ئالی عیمرانە)**

**بەشی دووەم وەڵامی وورد و تەفصیلی**

# بڕگەی دوازدە: ڕەدد و وەڵامی گشتگیر بۆ گومڕایان

وَأَنَا أَذْكُرُ لَكَ أَشْيَاءَ مِمَّا ذَكَر اللَّهُ في كِتَابِهِ جَوَابًا لِكَلامٍ احْتَجَّ بِهِ الْمُشْرِكُون في زَمَانِنا عَلَيْنا، فَنَقُولُ : جَوَابُ أَهْلِ الْبَاطِلِ مِنْ طَرِيقَيْنِ : مُجْمَلٌ ، وَمُفَصَّلٌ : أَمَّا الْمُجْمَلُ فَهُوَ الأَمْرُ الْعَظِيمُ ، وَالْفَائِدَةُ الْكَبِيرَةُ لِمَنْ عَقَلَهَا ، وَذَلِكَ قَوْلُهُ تَعَالَى: ﴿ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ مِنۡهُ ءَايَٰتٞ مُّحۡكَمَٰتٌ هُنَّ أُمُّ ٱلۡكِتَٰبِ وَأُخَرُ مُتَشَٰبِهَٰتٞۖ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمۡ زَيۡغٞ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَٰبَهَ مِنۡهُ ٱبۡتِغَآءَ ٱلۡفِتۡنَةِ وَٱبۡتِغَآءَ تَأۡوِيلِهِۦۗ وَمَا يَعۡلَمُ تَأۡوِيلَهُۥٓ إِلَّا ٱللَّهُۗ ﴿٧﴾ ﴾ آل عمران

منیش چەند شتێکت بۆ باس دەکەم ، کە خودا لە کتێبەکەیدا باسی کردووە ، ئەوانەش دەبنە وەڵام ، بۆ ئەو وتانەی کە موشریکەکانی ئەم زەمانەی خۆمان ، کردویانن بە بەڵگە بەسەرمانەوە.

دەڵێین وەڵامی ئەهلی باتڵ بە دوو ڕێگە دەبێت : یەکەم : وەڵامی گشتگیر ، دووەم : وەڵامی وورد و تەفصیلی .

وەڵامی گشتگیر کارێکی گەورەیە و سوودی زۆر گەورەی هەیە ، بۆ هەر کەسێك کە لێی تێبگات. چونکە بۆ هەموو کەسێك و بۆ هەموو شوێن و بۆ هەموو کاتێك و بۆ ڕەدد دانەوەی هەموو گومان و شوبهەیەك دەبێت . ئەو وەڵامە گشتگیرەش لەم ئایەتە وەردەگیرێت کە خودا فەرمویەتی :

{هُوَ الَّذِي أَنْزَلَ عَلَيْكَ الْكِتَابَ مِنْهُ آيَاتٌ مُحْكَمَاتٌ هُنَّ أُمُّ الْكِتَابِ } آل عمران ٧ تا کۆتایی ئایەتەکە.

واتە :( هەر ئەو خودایە ئەم قورئانەی دابەزاندووە ، بۆ سەرت . هەندێکی ئایەتە موحکەمەکانن واتە: ئەوانەی کە مەعناکانیان ڕوون و ئاشکرایە، بۆ هەموو کەس ، تەنها یەك مەعنایان هەیە و پێچ و پەنا هەڵناگرن ، ئەوانە ئەصڵ و ئەساسی قورئانن. وە هەندێکی دیکەشی موتەشابیهن واتە : مەعناکانیان لای هەموو خەڵکی تەواو ڕوون و ئاشکرا نییە و چەند مەعنایەك هەڵدەگرن .

**ئنجا ئەوانەی کە لە دڵیاندا نیەتی ئەوەیان هەیە کە لە حەق لابدەن و شوێن کوفر بکەون یان شوێن بیدعە بکەون یان شوێن ئارەزوەکانیان بکەون، سێ نیشانەیان تێدایە و جوان سەرنجیان بدە ،**

**یەکەم : واز دەهێنن لەو ئایەتانەی کە موحکەمن واتە ڕوون و ئاشکران خۆیانی لێ گێل دەکەن، ئنجا دەگەڕێن بە شوێن ئەو ئایەتانەی کە (موتەشابیهن ) واتە : ئەوانەی کە مەعنایان تەواو ڕوون نییە وچەند مەعنایەك هەڵدەگرن .**

**دووەم : مەبەستان ئەوەیە کە خۆیان و خەڵکیش توشی لادان و گومڕایی بکەن**

**سێیەم : مەبەستیان ئەوەیە کە ئایەتەکانی قورئان بە ڕەئی و ئارەزووی خۆیان تەفسیر بکەن .**

**بەڵام هیچ کەس تەئویل و واتای ئەو ئایەتانە نازانێت جگە لە ﷻ . هەروەها ئەوانەش کە لە زانستەکانی شەریعەتدا چەسپاون دەیزانن .**

| |
|---|
| وَقَدْ صَحَّ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم أَنَّهُ قَالَ :( إِذَا رَأَيْتُمُ الَّذِينَ يَتَّبِعُونَ الْمُتَشَابِهَ وَيَتْرُكُونَ الْمُحْكَمَ فَأُولَئِكَ الَّذِينَ سَمَّى اللَّهُ فِي كِتَابِهِ فَاحْذَرُوهُم ) [1] |

**لە حەدیسی صەحیحدا هاتووە کە پێغەمبەر فەرمویەتی :**

**﴿ هەر کاتێ ئەوانەت بینی کە دەگەڕان بە شوێن ئایەتە موتەشابیهەکاندا ، ئائەوانە ئەوانەن کە خودا ، باسی کردوون ، حەزەریان لێ بکەن ) تەواو**

**ڕوونکردنەوە : حەزەریان لێ بکەن واتە : تێکەڵاویان مەکەن گوێیان لێ مەگرن و سەیری کتێب و نوسراوەکانیان مەکەن، خۆتان دوور بگرن لە دەزگاکانی ڕاگەیاندنیان. نەوەك شتێکی ناحەق بڕواتە دڵتانەوە دوایی بەئاسانی لە دەستی دەرباز نابن .**

---

[1] ٥ صحيح البخاري: كتاب تفسير القرآن (٤٥٤٧) ، وصحيح مسلم: كتاب العلم (٢٦٦٥) ، وسنن الترمذي: كتاب تفسير القرآن (٢٩٩٤) ، وسنن أبي داود: كتاب السنة (٤٥٩٨) ، ومسند أحمد (٦/٢٥٦).

ئیمام بەغەوی له (شرح السنه) ( ١/ ٢٢٧)دا دەڵێت :( ئەصحاب و تابعین و شوێنكەوتوانی ئەوانیش و زانایانی ئەهلی سوننەت كۆك و هاودەنگن لەسەر دوژمنایەتی كردنی ئەهلی بیدعە و دوور كەوتنەوە لێیان.

مِثَالُ ذَلِكَ : إِذَا قَالَ لَكَ بَعْضُ الْمُشْرِكِين :
{أَلا إِنَّ أَوْلِيَاءَ اللَّهِ لا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلا هُمْ يَحْزَنُونَ} يونس ٦٢، وأَنَّ الشَّفَاعَةَ حَقٌّ ،
وَأَنَّ الأَنْبِيَاءَ لَهُمْ جَاهٌ عِنْدَ اللَّهِ ، أَوْ ذَكَرَ كَلاَماً لِلنَبِيِّ صلى الله عليه وسلم يَسْتَدِلُّ بِهِ عَلَى شَيء مِن بَاطِلِهِ وَأَنْتَ لاَ تَفْهَمُ مَعْنىَ الْكَلامِ الَّذِي ذَكَرَه ،

نمونەیەكی ئەوەی كە موشریكان ئایەتی موتەشابیه دەكەنە بەڵگە ، نمونەی وەڵامەكەشی ئەمەیە : ئەگەر موشریكێك گوتی: خودا فەرمویەتی
:{أَلا إِنَّ أَوْلِيَاءَ اللَّهِ لا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلا هُمْ يَحْزَنُونَ} يونس ٦٢
واته :﴿ به تەئكید ئەولیاكانی خودا هیج جۆرە ترس و خەوفێكیان لەسەر نییە و غەمباریش نابن ﴾
وأن الشفاعة حق، وأن الأنبياء لهم جاه عند الله
وە شەفاعەتیش حەقە و ، پێغەمبەرانیش لای خودا پلەیان بەرزە و ئێمەش داوا دەكەین لەو پیاوچاكانە لای خودا تكامان بۆ بكەن
یان ئەگەر فەرمودەیەكی پێغەمبەری باس كرد، كردیە بەڵگە لەسەر گوتە ناحەقەكانی و كارە ناحەقەكانی ، تۆش لە حاڵەدا بەو جۆرە تێ نەدەگەیشتی كە ئەو باسی دەكات. نەشتوانی وەڵامی تەفصیلی بدەیتەوە . ئەوا بجۆرە سەر ئەم وەڵامە گشتگیرە و بە سێ خاڵ جوابی بدەرەوە و بڵێ :

فَجَاوِبْهُ بِقَوْلِكَ : إِنَّ اللَّهَ ذَكَرَ أَنَّ الَّذِينَ في قُلُوبِهِمْ زَيْغٌ يَتْرُكُونَ الْمُحْكَمَ ، وَيَتَّبِعُونَ الْمُتَشَابِهَ

یەكەم : بە تەئكید ﷻ لە كتابەكەیدا باسی كردووە كە ئەوانەی لە دڵیاندا نیەتیان هەیە لابدەن لە حەق ، واز دەهێنن لەو ئایەتانەی كە مەعناكانیان لای

هەموو كەس ڕۆشنە و تەنها یەك مەعنا هەڵدەگرن، دەگەڕێن بە دوای ئەو ئایەتانەدا كە چەند مەعنایەك هەڵدەگرن. وەك تۆ ئەی موشریك كە وازت لەو ئایەتە هێناوە كە فەرمویەتی :﴿ فلا تدعوا مع الله أحدا ﴾

بە دوای ئەوەدا گەڕاویت كە پێغەمبەر فەرمویەتی :( أنَّ الشفاعةَ حقٌ )

بۆ ئەوەی بە ئارەزووی خۆت لێكی بدەیتەوە .

وَمَا ذَكَرْتُ لَكَ مِنْ أَنَّ اللَّهَ ذَكَرَ أَنَّ الْمُشْرِكِينَ يُقِرُّونَ بِالرُّبُوبِيَّةِ ، وَأَنَّهُ كَفَّرَهُمْ بِتَعَلُّقِهِمْ عَلَى الْمَلاَئِكَةِ، أَوْ الأَنْبِيَاءِ ، أَوْ الأَوْلِيَاءِ مَع قَوْلِهِمْ { هَؤُلاَءِ شُفَعَاؤُنَا عِنْدَ اللَّهِ } يونس ١٨
وَهَذَا أَمْرٌ مُحْكَمٌ بَيِّنٌ، لاَ يَقْدِرُ أَحَدٌ أَنْ يُغَيِّرَ مَعْنَاهُ

دووەم: ئەوەشم بۆت باسكرد (تۆش بۆی باس بكە) كە خودا باسی موشریكەكانی كردووە، كە ئەوان دان دەنێن بەوەدا كە ﷲ هەر خۆی پەروەردگارە باسی ئەوەش كراوە كە ئەو موشریكانە بەوە كافر بوون كە داوایان لە مەلائیكەتەكان و پێغەمبەران و ئەولیاكان دەكرد . لەگەڵ ئەوەشدا دەیانگوت ئەوانە تكاكار و شەفاعەتكاری ئێمەن لای ﷲ .

ئەم مەسەلەیەش بە تەواوی ڕوون و ئاشكرایە و هیچ پێچ و پەنایەك هەڵناگرێت، هیچ كەسیش ناتوانێت مەعناكەی بگۆڕێت .

ذَكَرْتَه لِي أَيُّهَا الْمُشْرِكُ مِن الْقُرْآنِ ، أَوْ كَلاَم النبيّ صلى الله عليه وسلم لا أَعْرِفُ مَعْنَاهُ ، وَلكِنْ أَقْطَعُ أنَّ كَلاَمَ اللَّهِ لاَ يَتَنَاقَضُ ، وَأَنَّ كَلاَمَ النَّبِيِّ صلى الله عليه وسلم لاَ يُخَالِفُ كَلاَمَ اللَّهِ وَهَذَا جَوَابٌ جَيِّدٌ سَدِيدٌ ، وَلكِنْ لا يَفْهَمُهُ إلاَّ مَنْ وَفَّقَهُ اللَّهُ ،
فَلا تَسْتَهن به ؛ فَإِنَّهُ كَمَا قَالَ تَعَالَى
{ وَمَا يُلَقَّاهَا إِلاَّ الَّذِينَ صَبَرُوا وَمَا يُلَقَّاهَا إِلاَّ ذُو حَظٍّ عَظِيمٍ } فصلت ٣٥

سێیەم : ئەوەی كە بۆ منت باس كرد لە قورئان و فەرمودەی پێغەمبەر ﷺ ، ئەی موشریك، من بەو جۆرە لێی تێ ناگەم كە تۆ باسی دەكەیت ، بەڵام دڵنیام كە ئایەتەكانی خودا پێچەوانەی یەكتر نین، وە دڵنیاشم كە فەرمودەی پێغەمبەر

ﷺ پێچەوانەی کەلامی خودا نییە، واتە: ئەو ئایەت و حەدیسانەی کە تۆ دەیهێنیتەوە پێچەوانەی ئەوانە نییە کە من بۆتم باس کرد.

ئەمەش وەڵامێکی ڕاست و تەواوە ، بەڵام تەنها ئەو کەسانە حاڵی دەبن کە خودا هیدایەتی داون .

ئەم وەڵامەش بە کەم مەزانە ، چونکە هەروەك خودا فەرمویەتی :( تەنها ئەو کەسانە ئەمە وەردەگرن کە صەبریان هەیە تەنها ئەو کەسانەش وەری دەگرن کە خودا بەشێکی گەورەی پێداون) فصلت ٣٥

# شوبهەی یەكەم : دەڵێن : هەر كەس تەنها الله بە پەروەردگار بزانێت ئەوە شەریكی بۆ خودا دانەناوە.

وأَمَّا الْجَوَابُ الْمُفصَّلُ فَإِنَّ أعْدَاءَ اللهِ لَهُم اعْتِرَاضَاتٌ كَثِيرَة عَلَى دِينِ الرُّسُلِ يَصُدُّونَ بِهَا النَّاسَ عَنْهُ . مِنْهَا قَوْلُهُمْ : نَحْنُ لاَ نُشْرِكُ باللَّهِ شَيْئاً ، بَلْ نَشْهَدُ أنَّهُ لا يَخْلُقُ ، وَلا يَرْزُقُ ، وَلاَ يَنْفَعُ ، وَلا يَضُرُّ إِلاَّ اللَّهُ – وَحْدَهُ لا شَرِيكَ لَهُ – ، وأَنَّ مُحَمَّدًا صلى الله عليه وسلم لا يَمْلِكُ لِنَفْسِهِ نَفعًا، وَلاَ ضَرًّا ، فَضْلاً عَنْ عَبْدِ الْقَادِرِ ، أَوْ غَيْرِهِ .
وَلكِنْ أَنَا مُذْنِبٌ ، وَالصَّالِحُونَ لَهُمْ جَاهٌ عِنْدَ اللَّهِ ، وَأَطْلُبُ مِن اللَّهِ بِهِمْ .

**دوژمنانی خودا نەیاری زۆر دەكەن لە دینی پێغەمبەران بەو هۆیەوە ، خەڵكی لەو دینە دوور دەخەنەوە . یەكێ لەوانە ئەوەیە كە دەڵێن : ئێمە شەریك بۆ خودا دانانێین ، بەڵكو شاهیدی دەدەین كە**
**هیچ كەس خالق نییە جگە لە ﷲ، هەر خۆی ڕزق دەدات ،**
**هیچ كەس سود و زەرەری بەدەست نییە جگە الله ، هەر خۆی ئەوانە دەكات و شەریكی نییە ، وە شاهیدیش دەدەین كە محمد خاوەنی هیچ سود و زەرەرێك نییە ، چ جای شێخ عبد القادر یان غەیری ئەو ، بەڵام شتێك هەیە كە من گوناهبارم (واتە بە حسابی خۆیان گوناهبار دوعاكەی ناگاتە لای خودا ).**
**دەڵێن دیارە كە پیاوچاكانیش پلەیان لای خودا بەرزە ، (ئەگەر داوای هەر شتێ بكەن لای خودا ، ئەوا خودا ڕەدی ناكاتەوە ) بۆیە داوا دەكەم لەو ئەولیا و پیاوچاكانە ، كە تكامان بۆ بكەن لای خودا ، واسیتەمان بۆ بكەن لای خودا ، كە خودا داواكانمان قبوڵ بكات.**

فَجَاوِبْهُ بِمَا تَقَدَّمَ ، وَهُوَ أَنَّ الَّذِينَ قَاتَلَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم مُقِرُّونَ بِمَا ذَكَرْتَ ، وَمُقِرُّونَ أَنَّ أَوْثَانَهُمْ لاَ تُدَبِّرُ شَيْئًا ، وِإِنَمَا أَرَادُوا مِمَّنْ قَصَدُوا الْجَاهَ وَالشَّفَاعَةَ ، وَاقْرَأْ عَلَيْهِ مَا ذَكَرَ اللَّهُ فِي كِتَابِهِ ، وَوَضَّحَهُ

**وەڵامی ئەم شوبهەیە بەمجۆرەیە كە بیژیت :**

**یەكەم : ئەو موشریكانەی كە پێغەمبەر جەنگی كرد لە دژیان ، هەر وەك تۆ شاهیدیان دەدا كە تەنها ﷲ خالقە ، و هەر خۆی ڕزق دەدات ، هەر خۆی سوود و زەرەری بە دەستە . ئەگەر بەڵگەت دەوێت لەو بارەیەوە ئەوا لە زۆر شوێنێكی قورئاندا ئەم مەسئەلەیە ڕوون كراوەتەوە لەوانە ئەو ئایەتانەی بۆ باس بكە كە لە لاپەڕەی ( ) (بڕگەی دووەم : عەقیدە و كردەوەی ئەوانەی كە پێغەمبەریان بۆ ڕەوانە كرابوو ) هێناومانە .**

**دووەم : ئەوەی بۆ ڕوون بكرێتەوە كە ئەو موشریكانە ، عەقیدەیان وابوو كە ئەو پیاوچاك و صاڵحانە هیچ زەرەر و قازانجێكیان بە دەست نییە . نە بۆ خۆیان و نە بۆ غەیری خۆیان .**

**سێیەم : ئەو موشریكانە ، داوایان دەكرد لە پیاوچاكان كە لای خودا تكایان بۆ بكەن**

**چوارەم : ئەو ئایەتانەی بۆ بخوێنەوە كە خودا لە كتێبەكەیدا ڕوونی كردوەتەوە كە داواكردن لە غەیری خودا ، وەك پێغەمبەران و صالحان ، و كردنی ئەوان بە تكاكار، ئەوە شەریك دانانە بۆ خودا .**

**یەكێ لەوانە ئەو ئایەتەیە كە خودا فەرمویەتی :**﴿ وَيَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَضُرُّهُمۡ وَلَا يَنفَعُهُمۡ وَيَقُولُونَ هَٰٓؤُلَآءِ شُفَعَٰٓؤُنَا عِندَ ٱللَّهِۚ قُلۡ أَتُنَبِّـُٔونَ ٱللَّهَ بِمَا لَا يَعۡلَمُ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِي ٱلۡأَرۡضِۚ سُبۡحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشۡرِكُونَ ﴿١٨﴾ ﴾ **یونس**

**واتە :( ئەو موشریكانە غەیری خودا دەپەرستن ( خۆشیان دەزانن ) كە ئەوانە نە زەرەریان پێ دەگەیەنن و نە قازانجیان پێ دەگەیەنن، و دەڵێن ئا ئەوانە**

**تكاكاری ئێمەن لای خودا ، لە كۆتایدا فەرمویەتی : خودا پاكە و بەرز و بڵندە لە شەریكایەتیەی كە بۆ خودایان داناوە)**

**ڕوونكردنەوە : هەندێ كەس دەڵێن ئێمە لە پاڵ قەبری پیاوچاكاندا لە خودا داوا دەكەین و دەپاڕێینەوە ، چونكە ئەو شوێنانە موبارەكن و شوێنی قبوڵ بوونی دوعان . دیارە ئەم جۆرە كارە بیدعەیە و شیركی بچوكە.**

# شوبهەی دووەم : دەڵێن: كافرەكان داوایان لە بتەكان دەكرد و ئێمە داوا لە صاڵحان دەكەین

فَإِنْ قَالَ : إِنَّ هَؤُلاَءِ الآَيَاتِ نَزَلَتْ فِيمَنْ يَعْبُدُ الأَصْنَامَ ،
كَيفَ تَجْعَلَونَ الصَالِحِينَ مِثْلَ الأَصْنَامِ ؟ ! أَمْ كَيْفَ تَجْعَلُونَ الأنْبِيَاءَ أَصْنَاماً ؟
فَجَاوِبْهُ بِمَا تَقَدَّمَ ، فَإِنَّهُ إِذَا أَقَرَّ أَنَّ الْكُفَارَ يَشْهَدُون بِالرُّبُوبِيَّةِ كُلِّهَا للَّهِ، وَأَنَّهُمْ مَا أَرَادُوا مِمَّن قَصَدُوا إِلاَّ الشَّفَاعَةَ ، وَلكِنْ إذا أَرَادَ أنْ يُفَرِّقَ بَيْنَ فِعْلِهِمْ وَفِعْلِهِ بِمَا ذَكَرَ

جا كە تۆ بەو جۆرە وەڵامی شوبهەی یەكەمت دایەوە ، جا ئەگەر ڕەددی تۆی دایەوە و گوتی : ئەو ئایەتانە واتە ئایەتی
{وَيَعْبُدُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ مَا لا يَضُرُّهُمْ وَلا يَنْفَعُهُمْ وَيَقُولُونَ هَؤُلاءِ شُفَعَاؤُنَا عِنْدَ اللَّهِ}
وە ئایەتەكانی دیكەش لە بارەی كەسانێكەوە دابەزیون كە بتیان دەپەرست ! چۆن پیاوچاكان و ئەولیاكان دەخەنە ڕیزی بتەكانەوە ؟
یان چۆن پێغەمبەرەكان دەكەن بە بت.

تۆش بەو جۆرە وەڵامی بدەرەوە كە لەمەو پێش باسمان كرد. جا ئەگەر دانی بەوەدا نا كە كافرەكان شاهێدیان دەدا بە هەموو جۆرەكانی پەروەردگاریدا، هەر جۆرە پەستنێكیان بۆ هەر كەسێك ئەنجام دابێت ، مەبەستیان تەنها ئەوە بووە كە لای خودا شەفاعەتیان بۆ بكات. بەڵام ئەگەر ویستی كاری خۆی جیا بكاتەوە لە كاری موشریكەكان ، بەو گوتانەی لەمەو بەر. ئەوا بۆی باس بكە كە كافرەكان لە پەرستنی غەیری خودادا چوار جۆریان هەبوو :

١. هەندێكیان بتیان دەپەرست
٢. هەندێكیان مەلائیكەتیان دەپەرست
٣. هەندێكیان پێغەمبەران و ئەولیاكانیان دەپەرست .
٤. هەندێكیان دار و بەردیان دەپەرست. ئەمەش خۆر و مانگ و ئەستێرەكانیش دەگرێتەوە.

پاشان ئەو بتانە و ئەو دار و بەردانەی کە کافرەکان عیبادەتیان دەکرد بۆیان ، کافرەکان باوەڕیان وابوو ، کە ڕۆحیانەتی ئەولیاکان لەو بتانەدا یان لەو دار و بەردانەدا ئامادە دەبن. بەڵگەش ئەو ئایەتەیە :

وَالَّذِينَ يَدْعُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ لَا يَخْلُقُونَ شَيْئًا وَهُمْ يُخْلَقُونَ (٢٠) أَمْوَاتٌ غَيْرُ أَحْيَاءٍ وَمَا يَشْعُرُونَ أَيَّانَ يُبْعَثُونَ (٢١)

واتە :(هەموو ئەوانەی کە ئێوە داوایان لێدەکەن جگە لە خودای گەورە . شایستەی پەرستن نین ، چونکە (خۆشتان دەزانن) ناتوانن هیچ شتێ دروست بکەن و خۆشیان دروستکراون. ئەوانە مردوون . وەك جاران زیندووش نین ، وەك ئەوەی کە ئێوە گومانیان پێ دەبەن . لەگەڵ ئەوەشدا ، هیچ هەست بەوەش ناکەن چی کاتێ خۆشیان زیندوو دەکرێنەوە). تەواو

کەواتە ئەم ئایەتە و تەواوی بەڵگەکانی قورئان و سوننەت ڕەددی ئەوە دەدەنەوە کە کافرەکانی کۆن دار و بەردی ڕووتیان پەرستبێت بەڵکو گومانیان وا بووە کە ڕۆحیانەتە پاکەکان لەو بتانەدا ئامادە دەبن و وەڵامی داواکاریەکانی ئەمان دەدەنەوە .

فَاذْكُرْ لَهُ أنَّ الْكُفَّارَ: مِنْهُمْ مَنْ يَدْعُو الأَصْنَامَ . وَمِنْهُمْ مَنْ يَدْعُو الأَوْلِيَاءَ الَّذِينَ قَالَ اللَّهُ فِيهِمْ { أُوْلَئِكَ الَّذِينَ يَدْعُونَ يَبْتَغُونَ إِلَى رَبِّهِمْ الْوَسِيلَةَ أَيُّهُمْ أَقْرَبُ وَيَرْجُونَ رَحْمَتَهُ وَيَخَافُونَ عَذَابَهُ } الإسراء : ٥٧. ويَدْعُونَ عِيسَى بْنَ مَرْيَمَ ، وَأُمَّهُ ، وَقَدْ قَالَ اللَّهُ تَعَالَى

﴿ مَّا ٱلْمَسِيحُ ٱبْنُ مَرْيَمَ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ ٱلرُّسُلُ وَأُمُّهُۥ صِدِّيقَةٌ ۖ كَانَا يَأْكُلَانِ ٱلطَّعَامَ ۗ ٱنظُرْ كَيْفَ نُبَيِّنُ لَهُمُ ٱلْءَايَـٰتِ ثُمَّ ٱنظُرْ أَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ ﴿٧٥﴾ ﴾ المائدة

بۆی باس بکە کە ئەو کافرانە هەندێکیان داوایان لە بتەکان دەکرد و هەندێکیان داوایان لە ئەولیاکان دەکرد ئەمانەش ئەوانەن کە خودا لە بارەیانەوە

فەرمویەتی : ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ يَبۡتَغُونَ إِلَىٰ رَبِّهِمُ ٱلۡوَسِيلَةَ أَيُّهُمۡ أَقۡرَبُ وَيَرۡجُونَ رَحۡمَتَهُۥ وَيَخَافُونَ عَذَابَهُۥٓۚ إِنَّ عَذَابَ رَبِّكَ كَانَ مَحۡذُورٗا ﴿٥٧﴾ ﴾ الإسراء

**واتای ئەم ئایەتە و ئایەتی ٥٦: ( بڵێ : بەو موشریکانە ( ئەوانەی کە خوداش دەپەرستن و غەیری خوداش دەپەرستن) ئادەی داوا بکەن لە هەموو ئەوانەی کە ئێوە دەیانپەرستن تا بۆتان دەربکەوێت ، ئایە ئەوانە دەتوانن بەڵایەك بە تەواوی لابدەن لە سەرتان یا دەتوانن بەڵاکە بگۆڕن ، یان بیگوێزنەوە بۆ شوێنێکی دی . دیارە کە ناتوانن . دەی بزانن ئەو( پێغەمبەران و صالحان و مەلائیکەتانەی) کە ئێوە دەیانپەرستن و داوایان لێ دەکەن ، ئەوانە خۆیان بە دوای سەبەب و هۆکارێکدا دەگەڕێن کە لە خودا نزیکیان بکاتەوە، هەر چی کردەوەیەك لە خودا نزیکیان دەکاتەوە ، ئەوە ئەنجام دەدەن .( دەی سەرنج بدەن کامتان لە خوداوە نزیکترە). لەگەڵ ئەوەشدا ئەوان بە تەمای ڕەحمەتی خودان و لە عەزابی خودا دەترسن ) تەواو**

**هەندێکیشیان عیسای کوڕی مەریەم و دایکی عیسایان دەپەرست لەو بارەوە خودا فەرمویەتی : {** مَا الْمَسِيحُ ابْنُ مَرْيَمَ إِلاَّ رَسُولٌ **}تا کۆتایی واتە :**

**﴿ عیسای کوڕی مەڕیەم تەنها پێغەمبەر بووە ( نەك خودا بوو بێت ) هەروەها دایکیشی صدیقە بووە (ئەمەش پلەیەکە لە خوار پێغەمبەرانەوە) ، ئەو دووانە خواردنیان دەخوارد ، بڕوانە چۆن ئایەتەکانیان بۆ ڕوون دەکەینەوە. پاش ئەم ڕوونکردنەوەیەش بڕوانە بەرەو چی گومڕاییەك دەڕۆن؟**

**ئنجا سوئالیان لێ بکە ئایا ئێوە کەسانێك دەپەرستن جگە لە ئەڵڵا ، کە خۆشتان دەزانن کە ئەوانە (واتە عیسا و دایکی عیسا) هیچ زیان و سودێکیان بە دەست نییە بۆ ئێوە، لەگەڵ ئەوەشدا تەنها خودا هەموو شتێك دەبیستێت، تەنها خودا هەموو شتێك دەزانێت (نەك پێغەمبەران و ئەولیاکان کەواتە بەو جۆرە نییە کە ئێوە گومان دەبەن )﴾**

واذكر له قوله تعالى:{وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ جَمِيعاً ثُمَّ يَقُولُ لِلْمَلائِكَةِ أَهَؤُلاءِ إِيَّاكُمْ كَانُوا يَعْبُدُونَ

قَالُوا سُبْحَانَكَ أَنْتَ وَلِيُّنَا مِنْ دُونِهِمْ بَلْ كَانُوا يَعْبُدُونَ الْجِنَّ أَكْثَرُهُمْ بِهِمْ مُؤْمِنُونَ}السبأ ٤٠، ٤١

**ئەوەشی بۆ باس بکە کە خودا فەرمویەتی ﴿ لە ڕۆژی قیامەتدا، خودا ئەوانە حەشر دەکات کە شەریکیان بۆ خودا داناوە ، پاشان بە مەلائیکەتەکان دەڵێت : ئایە ئەمانە ئێوەیان دەپەرست ؟ مەلائیکەتەکانیش حاشایان لێ دەکەن و دەڵێن: پاك و بێگەردی بۆ تۆ لەوەی کە شەریکت هەبێت ، تەنها تۆ دۆستی ئێمەیت نەك ئەوانە. بەڵکو ئەوانە شەیتانەکانیان دەپەرست (بە گوێڕایەڵی کردنیان) زۆربەی ئەو کافرانە ئیمانیان بە شەیتانەکان هەبوو﴾**

وقوله تعالى: {وَإِذْ قَالَ اللَّهُ يَا عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ أَأَنْتَ قُلْتَ لِلنَّاسِ اتَّخِذُونِي وَأُمِّيَ إِلَهَيْنِ مِنْ دُونِ اللَّهِ قَالَ سُبْحَانَكَ مَا يَكُونُ لِي أَنْ أَقُولَ مَا لَيْسَ لِي بِحَقٍّ إِنْ كُنْتُ قُلْتُهُ فَقَدْ عَلِمْتَهُ تَعْلَمُ مَا فِي نَفْسِي وَلا أَعْلَمُ مَا فِي نَفْسِكَ إِنَّكَ أَنْتَ عَلاَّمُ الْغُيُوبِ} المائدة ١١٦

**ئەو ئایەتەشی بۆ باس بکە کە فەرمویەتی**

**:﴿ ئەی محمد ﷺ باسی ئەوە بکە کاتێ خودا دەڵێت : بە عیسا ، ئەی عیسای کوڕی مەریەم ئایە تۆ بەو خەڵکەت گوتوە ، من و دایکم بکەن بە دوو پەرستراوی دیکە لەگەڵ خودادا ؟ عیساش لە وەلامدا دەڵێت : پاك و بێگەردی بۆ تۆ . هیچ وتەیەکی وەهام نییە و هیچ حەقێکم نییە شتێکی وا بڵێم . خۆ ئەگەر منیش وام گوتبێت ئەوا خۆت زانیوتە. تۆ دەزانیت چی لە نەفسی مندایە و من نازانم چی لە نەفسی تۆدایە. بە ڕاستی تەنها خۆت هەموو غەیب و نادیارێك دەزانیت ﴾**

فَقُلْ لَهُ : عَرَفْت أنَّ اللَّهَ كَفَّرَ مَنْ قَصَدَ الأَصْنَامَ ،
وَكَفرَ أَيْضاً مَنْ قَصَدَ الصَّالِحِينَ ، وَقَاتَلَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم

**ئەنجا پێی بڵێ : بە بەڵگەی ئەو ئایەتانە زانیت کە خودا ئەو کەسەی بە کافر داناوە کە هەر پەرستنێك بۆ بتەکان ئەنجام بدات.**

**هەروەها ئەو کەسەشی بە کافر داناوە کە هەر پەرستنێك بۆ هەر پیاوچاك و صاڵحێك ئەنجام بدات. پێغەمبەریش ﷺ لەسەر ئەوە جەنگی لە دژیان بەرپا کردووە.**

## شوبهەی سێیەم : دەڵێن : كافرەكان داوای پێویستیەكانیان لە صاڵحان دەكرد ، بەڵام ئێمە داوایان لێ دەكەین تكامان بۆ بكەن لای خودا.

فَإنْ قَالَ : الْكُفَّارُ يُرِيدُونَ مِنْهُم ، وَأَنَا أَشْهَدُ أَنَّ اللَّهَ هُوَ النَّافِعُ الضَّارُ الْمُدَبِّرُ ، لا أُرِيدُ إِلاَّ مِنْهُ ، وَالصَّالِحُونَ لَيْسَ لَهُمْ مِن الأَمْرِ شَيءٌ ، وَلكِنْ أَقْصُدُهُمْ أَرْجُو مِنَ اللَّهِ شَفَاعَتَهُمْ .

ئەگەر یەكێ لەو موشریكانە گوتی : كافرەكان داوای پێویستیەكانیان لە پەرستراوەكانیان دەكەن، بۆ نمونە دەیانگوت ئەی بتەكان ڕزقمان بدەن ، لەم ناخۆشیە نەجاتمان بدەن. بەڵام من جیام چونكە شایەدی دەدەم كە تەنها ئەللا زیان و قازانجی بەدەستە تەنها ئەو كاروبارەكان دەبات بەڕێوە.

( لا أريد إلا منه ): هەر شتێ داوا بكەم تەنها لە خودا داوا دەكەم ، نەك لە ئەولیا و مردووەكان. عەقیدەشم بەوە هەیە كە ئەو پیاوچاكان و صالحانە هیچ كارێكی پەروەردگاری و خەلقكردن و بەڕێوەبردنی كاروبارەكانیان بەدەست نییە.

بەڵام من كە ڕوو دەكەمە ئەولیاكان و هاواریان لێ دەكەم و نەزریان بۆ دەكەم و قوربانیان بۆ دەكەم، ئومێدم هەیە لای خودا كە تكای ئەوان قبوڵ بكرێت و واسیتەم بۆ بكەن.

فَالْجَوَابُ : أنَّ هَذَا قَوْلُ الْكُفَّارِ سَوَاءً بِسَوَاءٍ ، فَاقْرَأْ عَلَيْهِ قَوْلَهُ تَعَالَى
{ وَالَّذِينَ اتَّخَذُوا مِنْ دُونِهِ أَوْلِيَاءَ مَا نَعْبُدُهُمْ إِلاَّ لِيُقَرِّبُونَا إِلَى اللَّهِ زُلْفَى } الزمر٣
وَقَوْلَهُ تَعَالَى : {وَيَقُولُونَ هَؤُلاءِ شُفَعَاؤُنَا عِنْدَ اللَّهِ} يونس ١٨

وەڵامەكەی ئەوەیە : كە ئەم وتەیە هەمان وتەی كافرەكانە دەقاودەق ، ئەو ئایەتەی بۆ بخوێنەوە كە خودا فەرمویەتی: ﴿ ئەوانەی كە جگە خودا ، دۆستیان بۆ خۆیان داناوە ، بەوەی كە عیبادەتیان بۆ ئەنجام دەدەن ، عوزر بۆ خۆیان

دەهێننەوە و دەڵێن : ئێمە تەنها بۆ ئەوە عیبادەتەکان بۆ ئەوانە ئەنجام دەدەین ، هەتا به تکاو شەفاعەتیان له خودا نزیکمان بکەنەوە ﴾
ئەو ئایەتەشی بۆ بخوێنەوە که فەرمویەتی :﴿ ئەوانە تکاکار و شەفاعەتکاری ئێمەن لای خودا﴾

وَاعْلَمْ أَنَّ هَذِهِ الشُّبَهَ الثَّلاَثَ هِيَ أَكْبَرُ مَا عِنْدَهُمْ . فَإِذَا عَرَفْتَ أَنَّ اللَّهَ وَضَّحَهَا لنا في كِتَابِهِ ، وَفَهِمْتَهَا فَهْمَاَ جيِّدًا فَمَا بَعْدَهَا أيْسَرُ مِنْهَا

بزانە ئەم سێ شوبهەیە گەورەترین شوبهەیە لای ئەوان .
جا کە زانیت خودا لە کتێبەکەیدا بۆمانی ڕوون کردووەتەوە تۆش زۆر بە جوانی لێی حاڵی بوویت ، ئەوا ئەو شوبهانەی لەمەو بەدوا باس دەکرێن وەڵامدانەوەیان لەمانە ئاسانترن.

# شوبهەی چوارەم : دەڵێن : پەنابردن و داواكردن لە صاڵحان عیبادەت نییە.

فَإِنْ قَالَ : أَنَا لاَ أَعْبُدُ إِلاَّ اللَّهَ ، وَهَذَا الالْتِجَاءُ إِلَيْهِمْ وَدُعَاؤُهُمْ لَيْسَ بِعِبَادَةٍ.
فَقُلْ لَهُ : أَنْتَ تُقِرُّ أَنَ اللَّهَ فَرَضَ عَلَيْكَ إِخْلاَصَ الْعِبَادَةِ لله وَهُوَ حَقُّهُ عَلَيْكَ ؟ فَإِذَا قَالَ : نَعَمْ . فَقُلْ لَهُ : بَيِّنْ لِي هَذَا الَّذِي فَرَضَهُ اللَّهُ عَلَيْكَ ، وَهُوَ إِخْلاَصُ الْعِبَادَةِ لله وحْده، وَهُوَ حَقُّهُ عَلَيْكَ ؛ فَإِنَّهُ لاَ يَعْرِفُ الْعِبَادَةَ ، وَلاَ أَنْوَاعَهَا .
فَبَيِّنْهَا لَهُ بِقَوْلِكَ : قَالَ اللَّهُ تَعَالَى { ادْعُوا رَبَّكُمْ تَضَرُّعًا وَخُفْيَةً إِنَّهُ لا يُحِبُّ الْمُعْتَدِينَ } الأعراف ٥٥. فَإِذَا أَعْلَمتهُ بِهَذَا فَقُلْ لَهُ :
هَلْ علمت هذه عِبَادَةٌ للَّهِ ؟ فَلاَبُدَّ أن يَقُولَ : نَعَمْ ، وَالدُّعَاءُ مُخ الْعِبَادَة

**ئەگەر گوتی من جگە لە ﷲ كەسی دیكە ناپەرستم ، وە ئەم پەنابردن و داواكرنە لە صاڵحان عیبادەتكردن نییە.**

**تۆش لە وەڵامدا دوو نمونەی بۆ بهێنەرەوە كە هەر یەكەی دوو جوابی تێدایە :**

**<u>نمونەی یەكەم</u> : لەبارەی داواكردن و پاڕانەوە.**

**<u>جوابی یەكەم</u> : تۆش لە وەڵامدا بڵێ : ئایە دان بەوەدا دەنێیت كە خودا فەڕزی كردووە لە سەرت كە عیبادەتەكان بە ئیخلاصی بۆ خودا بكەیت ، ئەوەش حەقی خودایە لەسەر تۆ؟ جا ئەگەر گوتی : بەڵێ دان بەوەدا دەنێم؟**

**ئنجا لێی بپرسە : بۆم ڕوون بكەرەوە ئەوەی كە خودا فەڕزی كردووە لەسەرت كە ئەمەیە** (إخلاص العبادة لله وحده) **واتە : پوختە كردنی هەموو عیبادەتەكانە بۆ خودا بە تەنها ، كە ئەوەش حەقی خودایە لەسەر تۆ ؟**

**جا كە ، نەیزانی عیبادەت چییە و نەوعەكانیشی نەزانی (دیارە ناشزانێت) ، ئەوا بۆی ڕوون بكەرەوە و بڵێ : خودا فەرمویەتی**
{ادْعُوا رَبَّكُمْ تَضَرُّعاً وَخُفْيَةً}**واتە :**

**﴿ داوا لە پەروەردگاری خۆتان بكەن ، بە ملكەچی و بە دەنگێكی لەسەرخۆ ﴾**

**جا ئەگەر ئەمەت پێ ڕاگەیاند (کە بە بەڵگەی ئەو ئایەتە داواکردن عیبادەتە) ، ئەوجا لێی بپرسە : ئایا زانیوتە کە داواکردن لە خودا عیبادەتە؟ دیارە بە ناچاری دەڵێت بەڵێ. وە داواکردن کرۆکی عیبادەتکردن و پەرستنە.**

فَقُلْ لَهُ : إِذَا أَقْرَرْتَ أَنَّهَا عِبَادَةٌ ، وَدَعَوْتَ اللَّهَ لَيْلاً وَنَهَاراً ، خَوْفًا وَطَمَعاً ، ثُمَّ دَعَوْتَ فِي تِلْكَ الْحَاجَةِ نَبِيًّا ، أَوْ غَيْرَهُ ، هَلْ أَشْرَكْتَ في عِبَادَةِ اللَّهِ غَيْرَهُ ؟ فَلاَبُدَّ أن يَقُولَ : نَعَمْ

**جوابی دووەم : ئەنجا پێی بڵێ : مادام دانت بەوەدا نا کە داواکردن لە خودا عیبادەتە . ئەگەر شەو و ڕۆژ داوات لە خودا کرد بە ترس و تەماعەوە . پاشان بۆ ئەو پێویستیە داوات لە هەر پێغەمبەرێك یا لە غەیری پێغەمبەران کرد ، ئایا لە پەرستنی خودادا غەیری خودات کردووە بە شەریکی خودا یان نا ؟**

**بەناچاری دەڵێت : بەڵێ.**

فقل له فإذا عملت بقول الله تعالى: {فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَانْحَرْ} ، وأَطَعْتَ اللَّهَ ، وَنَحَرْتَ لَهُ ، هَلْ هَذِهِ عِبَادَةٌ ؟ فَلاَبُدَّ أن يَقُولَ : نَعَمْ . فَقُلْ لَهُ: إِذَا نَحَرْتَ لمخْلُوقٍ : نَبِيٍّ أَوْ جِنِّيٍّ أَوْ غَيْرِهِمَا ، هَلْ أَشْرَكْتَ فِي هَذِهِ الْعِبَادَةِ غَيْرَ اللَّهِ ؟ فَلاَبُدَّ أن يَقُولَ : نَعَمْ .

**نمونەی دووەم : لەبارەی قوربانی کردنەوە :**

**جوابی یەکەم : ئنجا پێی بڵێ کە زانیت خودا فەرمویەتی {فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَانْحَرْ} واتە :﴿نوێژەکانت تەنها بۆ پەروەردگارت بکە و تەنها بۆ ئەو قوربانی و سەربڕین ئەنجام بدە﴾ ئنجا ئەگەر گوێڕایەڵی خودات کرد و قوربانیت بۆ کرد ، ئایە ئەمە عیبادەتە؟ دیارە کە ناچار دەڵێت : بەڵێ ئەوانە عیبادەتن.**

**جوابی دووەم : لێی بپرسە : ئەگەر حەیوانێکت سەربڕی بۆ هەر مەخلوقێك جا هەر پێغەمبەرێك بێت یان جنۆکە بێت ، یان غەیری ئەوانە ئایە لەم پەرستنەدا غەیری خودات کردووە بە شەریکی خودا؟**

**ناچارە لە وەڵامدا بڵێت : بەڵێ.**

وَقُلْ لَهُ أَيْضاً : الْمُشْرِكُونَ الَّذِينَ نَزَلَ فِيهُم الْقُرْآنُ هَلْ كَانُوا يَعْبُدُونَ الْمَلاَئِكَةَ ، وَالصَّالِحِينَ ،

وَاللاَّتَ ، وَغَيْرَ ذَلِكَ ؟ فَلاَبُدَّ أن يَقُولَ : نَعَمْ .
فَقُلْ لَهُ : وَهَلْ كَانَتْ عِبَادَتُهُمْ إِيَّاهُمْ إلاَّ في الدُّعَاءِ ، وَالذَّبْحِ ، وَالالْتِجَاءِ ، وَنَحْوِ ذَلِكَ ؟ وَإلاَّ فَهُمْ مُقِرُّونَ أَنَّهُمْ عَبِيدُهُ ، وَتَحْتَ قَهْرِه، وَأنَّ اللَّهَ هُوَ الَّذِي يُدَبِّرُ الأمْرَ ، وَلكِنْ دَعَوْهُمْ ، وَالْتَجَؤُوا إِلَيْهِمْ لِلجَاهِ والشَّفَاعَةِ، وَهَذَا ظَاهِرٌ جِدًا

**نەوعی دووەم : هەروەها پێی بڵێ: ئەو موشریكانەی كە قورئانیان لە بارەوە دابەزیوە . ئایە مەلائیكەت و صاڵحان و پیاوچاكان و لات و غەیری ئەوانەیان نەدەپەرست ؟ ناچارە بڵێت : بەڵێ.**

**ئنجا پێی بڵێ : ئایە ئەوانە كە غەیری خودایان دەپەرست ، ئایە هەر ئەوە نەبوو كە داوایان لە غەیری خودا دەكرد و قوربانیان بۆ دەكردن و هانایان بۆ دەبردن ؟ ئەگەر نا ئەوان دانیان بەوەدا دەنا كە خۆیان عەبدی خودان و لە ژێر دەسەڵاتی خودادان ، دانیشان بەوەدا دەنا كە تەنها الله هەموو كاروبارەكان بەڕێوە دەبات. بەڵام موصیبەتی هەرەگەورە لەوەدا بوو كە ئەوان داوایان لەو كەسانە دەكرد و پەنایان بۆ ئەوان دەبرد ئەمەش لەبەر ئەوە بووە كە ئەوانە لای خودا پلەیان بەرز بووە و تەماعی ئەوەیان هەبووە كە لای خودا شەفاعەتیان بۆ بكەن و واسیتەیان بۆ بكەن . ئەم مەسەلەیەش زۆر ڕوون و ئاشكرایە .**

# شوبهەی پێنجەم : دەڵێن : ئایە ئینكاری لە شەفاعەتی پێغەمبەر دەكەیت؟

فَإِنْ قَالَ : أَتُنْكِرُ شَفَاعَةَ رَسُولِ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم وَتَبْرَأُ مِنْهَا ؟
فَقُلْ لاَ أُنْكِرُهَا ، وَلاَ أَتَبَرَّأُ مِنْهَا، بَلْ هُوَ صلى الله عليه وسلم الشَّافِعُ الْمُشَفَّعُ ، وَأَرْجُو شَفَاعَتَهُ

**جا ئەگەر گوتی ئایە ئینكاری لە شەفاعەتی پێغەمبەر ﷺ دەكەیت و حاشای لێدەكەیت؟**

**تۆش لە وەڵامدا بڵێ: هیچ ئینكاری لێ ناكەم و حاشای لێ ناكەم ، بەڵكو شایەدی دەدەم كە پێغەمبەرمان ﷺ، شەفاعەتكارە و كراوە بە تكاكار و شەفاعەتكار، ئومێدیشم هەیە كە یەكێك بم لەوانەی كە پێغەمبەر ﷺ تكا و شەفاعەتی بۆ دەكات.**

وَلكِنَّ الشَّفَاعَةَ كُلَّهَا لِلَّهِ ، كَمَا قَالَ تَعَالَى { قُلْ لِلَّهِ الشَّفَاعَةُ جَمِيعاً } الزمر ٤٤.
وَلاَ تَكُونُ إِلاَّ مِن بَعْدِ إِذْنِ اللَّهِ كَمَا قَالَ تَعَالَى { مَنْ ذَا الَّذِي يَشْفَعُ عِنْدَهُ إِلاَّ بِإِذْنِهِ } البقرة ٢٥٥ ، وَلاَ يَشْفَعُ فِي أَحَدٍ إِلاَّ مِن بَعْدِ أنْ يَأْذَنَ اللَّهُ فِيهِ كَمَا قَالَ تَعَالَى { وَلاَ يَشْفَعُونَ إِلاَّ لِمَنِ ارْتَضَى } الأنبياء ٢٨، وَهُوَ لاَ يَرْضى إِلاَّ التَّوْحِيدَ كَمَا قَالَ تَعَالَى { وَمَنْ يَبْتَغِ غَيْرَ الإِسْلاَمِ دِينًا فَلَنْ يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِي الآخِرَةِ مِنَ الْخَاسِرِينَ } آل عمران٨٥

**بەڵام با چوار شت بزانین:**

**<u>یەكەم</u>: شەفاعەت هەموو جۆرەكانی تەنها موڵكی خودایە. هەروەك خودا فەرمویەتی : { قُلْ لِلَّهِ الشَّفَاعَةُ جَمِيعاً } واتە: ( هەموو جۆرەكانی شەفاعەت تەنها موڵكی خودایە ) كەواتە : موڵكی هیچ پێغەمبەر و هیچ كەسێكی نزیك لە خودا نییە ، لەوانەی داوا مەكەن بەڵكو تەنها لە خودای داوا بكەن).**

**<u>دووەم</u> : شەفاعەتیش لای خودا ناكرێت ، تەنها دوای ئەوە نەبێت كە خودا خۆی ئیزن دەدات. هەروەك فەرمویەتی :**

{ مَنْ ذَا الَّذِي يَشْفَعُ عِنْدَهُ إِلاَّ بِإِذْنِهِ } البقرة ٢٥٥ واته: كێ هەیە لای خودا شەفاعەت بكات ؟ مەگەر كەسێ كە خودا خۆی ئیزنی پێ بدات.

سێیەم : هیچ كەس ناتوانێت تكا و شەفاعەت بۆ هیچ كەس بكات مەگەر بۆ كەسێك كە خودا خۆی ئیزن بدات شەفاعەتی بۆ بكرێت ، هەروەك خودا فەرمویەتی : { وَلاَ يَشْفَعُونَ إِلاَّ لِمَنِ ارْتَضَى } الأنبياء ٢٨ واتە ئەوانە شەفاعەت بۆ هیچ كەس ناكەن ، مەگەر بۆ كەسێك كە خودا ڕازی بێ شەفاعەتی بۆ بكرێت .

چوارەم : خودا ڕازی نابێت شەفاعەت بۆ هیچ كەس بكرێت جگە لە ئەهلی تەوحید. هەروەك خودا فەرمویەتی

:{ وَمَنْ يَبْتَغِ غَيْرَ الإِسْلاَمِ دِينًا فَلَنْ يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِي الآخِرَةِ مِنَ الْخَاسِرِينَ } آل عمران٨٥

واتە : (هەركەس جگە لە ئیسلام هەر ڕێباز و ڕێگەیەكی دیكە بگرێتە بەر ئەوا لێی قبوڵ ناكرێت، بە تەئكید ئەو كەسەش لە ئاخیرەتدا ، یەكێكە لەوانەی كە یەكجار خەسارەتمەندن)

| |
|---|
| فَإِذَا كَانَتِ الشَّفَاعَةُ كُلُّهَا لِلَّهِ ، وَلاَ تَكُونُ إِلاَّ بَعْدَ إِذْنِهِ ، وَلاَ يَشْفَعُ النَّبِيُّ صلى الله عليه وسلم ، وَلاَ غَيْرُهُ فِي أَحَدٍ حَتَّى يَأْذَنَ اللَّهُ فِيهِ ، وَلاَ يَأْذَنُ إِلاَّ لأَهْلِ التَّوْحِيدِ تَبَيَّنَ لك أَنَّ الشَّفَاعَةَ كُلَّهَا لِلَّه ، فَأَطْلُبُهَا مِنْهُ فَأَقُولُ : اللَّهُمَّ لاَ تَحْرِمْنِي شَفَاعَتَه ، اللَّهُمَّ شَفِّعْهُ فِيَّ ، وَأَمْثَالُ هَذَا |

جا مادام بۆمان دەركەوت كە

- شەفاعەت هەر هەموی موڵكی خودایە .
- شەفاعەتیش ناكرێت ئیلا دوای ئەوە نەبێت كە خودا خۆی ئیزن دەدات .
- شەفاعەتیش بۆ هیچ كەس ناكرێت ، ئیلا بۆ كەسێك نەبێت كە خودا خۆی ئیزن دەدات كە شەفاعەتی بۆ بكرێت .
- خوداش ئیزن نادات شەفاعەت بۆ هیچ كەس بكرێت جگە لە ئەهلی تەوحید.

لێرەدا بۆت دەركەوت كە شەفاعەت تەنها موڵكی خودایە ، كەواتە تەنها لە خودای داوا دەكەم و دەڵێم :خودایە بێبەشم نەكەیت لە شەفاعەتی پێغەمبەر ،

**خودایە بیکەیت بە شەفاعەتکاری من . ئەگەر داوای شەفاعەتی هەر کەسێکیش بکەم هەر بەو جۆرە داوا دەکەم .**

فَإِنْ قَالَ : النَّبِيُّ صلى الله عليه وسلم أُعْطِيَ الشَّفَاعَةَ ، وَأَنَا أَطْلُبُهُ مِمَّا أَعْطَاهُ اللَّهُ.

**جا ئەگەر گوتی : پێغەمبەر ﷺ شەفاعەتی پێدراوە ، منیش داوای شتێکی لێدەکەم کە خودا پێی داوە.**

فَالْجَوَابُ : أَنَّ اللَّهَ أَعْطَاهُ الشَّفَاعَةَ، وَنَهَاكَ عَنْ هَذَا ، فقَالَ { فَلاَ تَدْعُوا مَع اللَّهِ أَحَدًا } وَطَلَبُكَ مِنَ اللَّهِ شَفَاعَةَ نَبِيِّهِ صلى الله عليه وسلم عِبَادَةٌ ، وَاللَّهُ نَهَاكَ أَنْ تُشْرِكَ فِي هَذِهِ الْعِبَادَةِ أَحَدًا

فَإِذَا كُنْتَ تَدْعُو اللَّهَ أَنْ يُشَفِّعَهُ فِيكَ فَأَطِعْهُ فِي قَوْلِهِ { فَلاَ تَدْعُوا مَع اللَّهِ أَحَدا } الجن ١٨.

**وەڵامەکەی بەمجۆرەیە : کە خودا شەفاعەتی داوە پێی ، لەگەڵ ئەوەشدا نەهی کردووە لێت ، و قەدەغەی کردووە ، کە داوای تکا و شەفاعەتی لێ بکەیت : ئەوەتە فەرمویەتی :**

**{ فَلاَ تَدْعُوا مَع اللَّهِ أَحَدًا } واتە :( لەگەڵ خودادا ،داوا لە هیچ کەس مەکە).**

**ئەوەش کە داوای شەفاعەتی پێغەمبەر ﷺ لە خودا بکەیت ، ئەوە عیبادەتکردنە بۆ خودا . خوداش قەدەغەی کردووە لێت کە لەم عیبادەتەدا هیچ کەس بکەیت بە شەریکی خودا. جا ئەگەر تۆ داوا دەکەیت کە ئەو پێغەمبەرە بکات بە شەفاعەتکار و تکاکارت ، دەی تۆش ئیتاعەی خودا بکە لەوەدا کە فەرمویەتی:{ فَلاَ تَدْعُوا مَع اللَّهِ أَحَدًا }**

وَأَيْضاً فَإِنَّ الشَّفَاعَةَ أُعْطِيَهَا غَيْرَ النَّبِيّ صلى الله عليه وسلم فَصَحَّ أَنَّ الْمَلاَئِكَةَ يَشْفَعُونَ ، وَالأَفْرَاطَ يَشْفَعُونَ ، وَالأَوْلِيَاءَ يَشْفَعُونَ . أَتَقُولُ : إِنَّ اللَّهَ أَعْطَاهُم الشَّفَاعَةَ، فَأَطْلُبُهَا مِنْهُمْ ؟
فَإِنْ قُلْتَ هَذَا رَجَعْتَ إِلَى عِبَادَةِ الصَّالِحِينَ الَّتِي ذَكَرَهَا اللَّهُ فِي كِتَابِهِ .
وَإنْ قُلْتَ : لاَ ، بَطَلَ قَوْلُكَ : أَعْطَاهُ اللَّهُ الشَّفَاعَةَ، وَأَنَا أَطْلُبُها مِمَّا أَعْطَاهُ اللَّه .

هەروەها وەڵامی دووەمیش ئەمەیە : دیارە کە غەیری پێغەمبەریش ﷺ کەسانی دیکەش هەن کە شەفاعەتیان پیٚ درابێت. لە حەدیسی صحیح دا هاتووە کە ملائیکەتەکان شەفاعەت دەکەن ،

منالٚی نابالٚغ کە پێش دایك و بابیان دەمرن ، شەفاعەت دەکەن ،

ئەولیاکانیش شەفاعەت دەکەن. ئایە تۆ دەڵێیت : ئەوانەش شەفاعەتیان پێدراوە و منیش داوای شەفاعەتکردنیان لێدەکەم ؟

جا ئەگەر ئەمەت گوت ، ئەوا گەڕایتەوە بۆ پەرستنی پیاوچاکان – ئەوەی کە خودا لە قورئانەکەیدا باسی کردووە –

بەڵام ئەگەر گوتت : نەخەیر داوا لەوانەش ناکەم کە شەفاعەتم بۆ بکەن ، ئەوا قصەکەی خۆتت پوچەڵ کردەوە کە گوتت : خودا شەفاعەتی پێداوە و منیش داوای ئەو شەفاعەتەی لێدەکەم کە خودا پێی داوە.

# شوبهەی شەشەم : دەڵێن : پەنابردن بۆ صاڵحان شیرك نییە یان دەڵێن شیرك تەنها بتپەرستیە

ئەم شوبهەیە لە ئەنجامی ئەودا هاتووە کە ئەوانەی غەیری خودا دەپەرستن ، نازانن عیبادەت چییە و نازانن شیرك چییە و نازانن تەوحید چییە. تۆش باش سەرنج بدە چی دەڵێن و چۆن وەڵامیان دەدەیتەوە.

فَإِنْ قَالَ : أنَا لاَ أُشْرِكُ بِاللَّهِ شَيْئًا ، حَاشَا وَكَلاَّ، وَلكِن الالْتِجَاء إِلَى الصَّالِحِينَ لَيْسَ بِشِرْكٍ .
فَقُلْ لَهُ : إِذَا كُنْتَ تُقِرُّ أنَّ اللَّهَ حَرَّمَ الشِّرْكَ أعْظَمَ مَنْ تَحْرِيم الزِّنا ، وَتُقِرُّ أنَّ اللَّهَ لاَ يَغْفِرُهُ ، فَمَا هَذَا الأَمْرُ الَّذِي حرمهُ اللَّه ، وَذَكَرَ أنَّهُ لاَ يَغْفِرُهُ ؟، فَإِنَّهُ لاَ يَدْرِي .

ئەگەر گوتی من شەریك بۆ خودا دانانێم من دوورم لەو کارە و شتی وا لە من ناوەشێتەوە. پەنابردنیش بۆ پیاوچاکان و صاڵحان شیرك نییە.

تۆش بە دوو جۆر وەڵامی بدەرەوە:

یەکەمیان بڵێ : مادام تۆ دان دەنێیت بەوەدا کە خودا شیرکی حەرام کردووە ، لە زیناش زیاتر حەرامی کردووە، دان بەوەشدا دەنێیت کە خودا هەرگیز لێی خۆش نابێت. دەی پێم بڵێ ئەو کارە چییە کە خودا حەرامی کردووە ، و لە قورئانیشدا باسی کردووە کە لێی خۆش نابێت ؟

گومانت نەبێت ، ئەو کەسە نازانێت شیرك چییە ناشزانێت تەوحید چییە .

فَقُلْ لَهُ : كَيْفَ تُبَرِّئُ نَفْسَكَ مِن الشِّرْكِ وَأنْتَ لاَ تَعْرِفُهُ ؟
أم كَيْفَ يُحَرِّمُ اللَّهُ عَلَيْكَ هَذَا ، وَيَذْكُرُ أنَّهُ لاَ يَغْفِرُهُ وَلاَ تَسْأَلُ عَنْهُ ، وَلاَ تَعْرِفُهُ ؟
أَتَظُنُ أَنَّ اللَّهَ عز وجل يُحَرِّمُهُ ، وَلاَ يُبَيِّنُهُ لَنَا ؟!

تۆش پێی بڵێ : چۆن خۆت بەری دەکەیت لە شیرك و لەگەڵ ئەوەشدا نازانیت شیرك چییە ؟! یان چۆن خودا ئەو کارەت لەسەر حەرام دەکات و باسی ئەوەش دەکات کە خودا لێی خۆش نابێت ، چۆن ئەوەندە بێ غەمیت ، سوئالی لەبارەوە

**ناكەیت و هەوڵ نادەیت فێر ببیت ؟ ئایا وا گومان دەبەیت كە خودا شیركی حەرام كردووە و بۆمانی ڕوون ناكاتەوە كە شیرك چییە ؟**

فَإِنْ قَالَ: الشِّرْكُ عِبَادَةُ الأَصْنَامِ ، وَنَحْنُ لاَ نَعْبُدُ الأَصْنَامَ .
فَقُلْ لَهُ : مَا مَعْنى عِبَادَةِ الأَصْنَامِ؟ أَتَظُنُّ أَنَّهُمْ يَعْتَقِدُونَ أَنَّ تِلْكَ الأَخْشَابَ والأَحْجَارَ تَخْلُقُ ، وَتَرْزُقُ ، وَتُدَبِّرُ أَمْر مَنْ دَعَاهَا ؟ فَهَذَا يُكَذِّبُهُ الْقُرْآنُ .
فَإِنْ قَالَ : هُو مْن قصَد خَشَبَةً ، أَوْ حَجَرًا، أَوْ أبنِيَّةً عَلَى قَبْرٍ أَوْ غَيْرِهِ ، يَدْعُونَ ذَلِكَ ، وَيَذْبَحُونَ لَهُ ، يَقُولُونَ : إِنَّهُ يُقَرِّبُنَا إِلَى اللَّهِ زُلْفَى، وَيَدْفَعُ اللَّهُ عنّا بِبَرَكَتِهِ ، أويعْطِينَا بِبَرَكَتِه.

**جا ئەگەر گوتی : شیرك واتە : بتپەرستی ، ئێمەش بت ناپەرستین.**

**– لێی بپرسە مەعنای بتپەرستی چییە؟ تۆ وا دەزانیت كە كافرەكانی كۆن كە بتپەرستیان دەكرد ، عەقیدەیان وا بووە كە ، ئەو دار و بەردانە خالقن و ڕزقی خەڵكی دەدەن و كاروباری ئەو كەسانە بەڕێوە دەبەن كە هاواریان بۆ دەبەن و داوای پێویستیەكانیان لێ دەكەن ؟ خۆ ئەگەر وا دەزانیت ئەوە قورئان ئەمەی بەدرۆ خستوەتەوە.**

**– جا ئەگەر گوتی : بتپەرستی ئەوەیە : هەركەسێ (بەدڵ یا بە كردەوە) ڕوو بكاتە دارێك یان بەردێك . یان بینایەك لە سەر قەبرێك بێت یان لەسەر غەیری قەبر بێت ، ئەو موشریكانە داوایان لێدەكەن و قوربانی و سەربڕینیان بۆ دەكەن (یان هەر جۆرە عیبادەتێكیان بۆ ئەنجام دەدەن)، دەڵێن ئائەوانە لە خودامان نزیك دەكەنەوە، بە بەرەكەتی ئەوانەوە ، خودا بەڵامان لەسەر لادەدات ، یان بە بەرەكەتی ئەوانەوە خودا پێمان دەبەخشێت.**

فَقُلْ : صَدَقْتَ وَهَذَا هُوَ فِعْلُكُمْ عِنْدَ الأَحْجَارِ، وَالْأبنية الَّتي عَلَى الْقُبُورِ وَغَيْرِهَا .
فَهَذَا أَقَرَّ أَنَّ فِعْلَهُمْ هَذَا هُوَ عِبَادَةُ الأَصْنَامِ ، وَهُوَ الْمَطْلُوبُ

تۆش لە وەڵامدا بڵێ ڕاستت كرد ، ئەو كارەی ئەوان هەمان كاری ئێوەیە كە تێی كەوتوون، كە لای بەرد و لەلای ئەو بینایانە ئەنجامی دەدەن كە لەسەر قەبران ، و لە شوێنانی دیكەشدا دروستكراون.

بەمشێوەیە ، دانی بەوەدا نا كە ئەم كارەیان هەمان كاری بتپەرستییە ، بەمەش گەیشتینە مەبەست كە ڕوونكرنەوەی شیرك و تەوحیدە.

ويُقال لهُ أَيْضاً قَوْلُكَ (الشِّرْكُ عِبَادَةُ الأَصْنَامِ) ، هَلْ مُرَادُكَ أَنَّ الشِّرْكَ مَخْصُوصٌ بِهَذَا ؟ وَأَنَّ الاعْتِمَادَ عَلَى الصَّالِحِينَ ، وَدعُاءَهُمْ لا يَدْخُلُ فِي ذَلِك ؟ فَهَذَا يَرُدُّهُ مَا ذَكَرَه اللَّهُ في كِتَابِهِ مِنْ كُفْرِ مَنْ تَعَلَّقَ عَلَى الْمَلائِكَةِ ، أَوْ عِيسَى، أَوْ الصَّالِحِين . فَلابُدَّ أَنْ يُقِرَّ لَكَ أَنَّ مَنْ أَشْرَكَ فِي عِبَادَةِ اللَّهِ أَحَدًا مِنَ الصَّالِحِينَ فَهُوَ الشِّرْكُ الْمَذْكُورُ فِي الْقُرْآنِ ، وَهَذَا هُوَ الْمَطْلُوبُ

وەڵامی دووەم : پێی بڵێ : كە تۆ دەڵێیت : (شەریك دانان بۆ خودا بتپەرستنە) ، ئایا مەبەستت ئەوەیە كە شیرك تەنها بتپەرستی دەگرێتەوە ؟

وا دەزانیت كە پشت بەستن بە صاڵحان و داواكردن لێیان شیرك نییە؟

وا دەزانیت داواكردن و پاڕانەوە لێیان ناچێتە ڕیزی شیركەوە ؟

ئەمەش خودا بەوە ڕەدی داوەتەوە كە لە قورئانەكەیدا باسی كافر بوونی ئەو كەسەی كردووە كە دڵی پەیوەست بكات بە مەلائیكەتەكان یان بە عیساوە یان بە صاڵحانەوە .

ناچارە كە دان بنێ بەوەدا كە هەركەسێ لە پەرستنی خودادا هەر پیاوچاك و صاڵحێ بكات بە شەریكی خودا ، ئەمە ئەو شیركەیە كە لە قورئاندا باسی كردووە. ئەمەش مەبەستی ئێمەیە .

وَسِرُّ الْمَسأَلَةِ أَنَّهُ إِذَا قَالَ :(أَنَا لاَ أُشْرِكُ بِاللَّهِ) فَقُلْ لَهُ : وَمَا الشِّرْكُ بِاللَّهِ فَسِّرْهُ لِي ؟

فَإِن قَالَ : هُوَ عِبَادَةُ الأَصْنَامِ ، فَقُلْ : وَمَا معنى عِبَادَةُ الأَصْنَامِ ؟ فَسِّرْهَا لِي ؟
وَإِنْ قَالَ : أنَا لاَ أعْبُدُ إِلاَّ اللَّهَ ، فَقُلْ : مَا مَعْنَى عِبَادَةِ اللَّهِ وَحْدَهُ لا شَرِيكَ لَهُ ؟ فَسِّرْهَا لي ؟

**سیڕی ئەم مەسەلەیەش ( واتە جوابی ئەم شوبهەیە بە کورتی) ئەوەیە :**

**– ئەگەر گوتی : من شەریك بۆ خودا دانانێم**

**بڵێ : شەریك دانان بۆ خودا چییە بۆم ڕوون بکەرەوە ؟**

**– ئەگەر گوتی شیرك بتپەرستییە .**

**بڵێ : ئەی مەعنای بتپەرستی چییە؟ بۆم ڕوون بکەرەوە ؟**

**– ئەگەر گوتی : من جگە لە الله هیچی دیکە ناپەرستم ،**

**تۆش لێی بپرسە : دەی پەرستنی خودا بەتەنها و بە بێ شەریك چییە ، مەعنای چییە و بۆم ڕوون بکەرەوە؟**

فَإِنْ فَسَّرَهَا بِمَا بَيَّنَهُ الْقُرْآنُ فَهْو الْمطْلُوبُ .
وَإِن لَمْ يَعْرِفْهُ فَكَيْفَ يَدَّعِي شَيْئًا وَهُوَ لاَ يَعْرِفُهُ ؟ وَإِنْ فَسَّرَ ذلك بِغَيْرِ مَعْنَاهُ بَيَّنْتَ لَهُ الآيَاتِ الْوَاضِحَاتِ فِي مَعْنَى الشِّرْكِ بِاللَّهِ ، وَعِبَادَةِ الأَوْثَانِ وأنَّهُ الَّذِي يَفْعَلُونَ فِي هَذَا الزَّمَانِ بِعَيْنِهِ ، وَأَنَّ عِبَادَةَ اللَّهِ وَحْدَهُ لا شَرِيكَ لَهُ هِيَ التِي يُنْكِرُونَ عَلَيْنَا ، وَيَصِيحُونَ مِنْهُ كَمَا صَاحَ إِخْوَانُهُمْ حَيْثُ قَالُوا :{ أَجَعَلَ الآلِهَةَ إِلَهًا وَاحِدًا إِنَّ هَذَا لَشَيْءٌ عُجَابٌ }ص : ٥

**جا ئەگەر بەو جۆرە تەفسیری کرد و ڕوونی کردەوە کە قورئان ڕوونی کردووەتەوە ئەوە گەیشتینە مەبەست . جا ئەگەر نەیزانی پێی دەڵێیت چۆن دیعایەی شتێ دەکات و خۆی بە خاوەنی شتێ دەزانێت کە نازانێت ئەو شتە چییە.؟**

**جا ئەگەر بە مەعنایەکی هەڵە تەفسیری کرد ، ئەوا تۆش ئەو ئایەتە ڕوونانەی بۆ باس دەکەیت کە مەعنای شەریك دانان بۆ خودا ڕوون دەکاتەوە ، و مەعنای بتپەرستی ڕوون دەکاتەوە . ئەم کارەی کە لەم زەمانەدا دەیکەن ، هەمان شتە کە لە قورئاندا باسی کراوە و کافرەکانی کۆن ئەنجامیان دەدا.**

ئەمەش واتە پەرستنی خودا بە تەنها بیٚ شەریك ، هەمان ئەو شتەیە كە ئیٚمە كاری پیٚدەكەین و بانگەوازی بۆ دەكەین. ئەمانە بە كاریٚكی خراپی دەزانن و لە تاوا هاواریان لیٚ هەستاوە. هەروەك براكانیان لە دەست بانگەوازی تەوحید و یەكخوداپەرستی هاواریان لیٚ هەستا و گوتیان :

{ أَجَعَلَ الآلِهَةَ إِلَهًا وَاحِدًا إِنَّ هَذَا لَشَيْءٌ عُجَابٌ }

واتە: (ئایا ئەو هەموو پەرستراوەی نەهیٚشت و تەنها یەك پەرستراوی هیٚلاٚیەوە بەڕاستی ئەمە شتیٚكی زۆر عەجیبە)

# شوبهەی حەوتەم : دەڵێن : کافرەکانی کۆن تەنها بەوە کافر بوون کە گوتیان خودا کوڕ و کچی هەیە

فَإِنْ قَالَ : إِنَّهُمْ لا يَكْفُرُون بِدُعَاءِ الْمَلاَئِكَةِ، وَالأَنْبِيَاءِ وَإِنَّمَا يكفرُون لَمَّا قَالُوا : الْمَلاَئكَةُ بَنَاتُ اللَّهِ . وَنَحْنُ لَمْ نَقُلْ عَبْدُ الْقَادِرِ بنُ اللهِ، وَلاَ غَيْرَهُ .

جائەگەر گوتی: ئەوان بەوە کافر نەبوون کە داوایان لە ملائیکەتەکان و پێغەمبەران کردووە ، بەڵکو بەوە کافر بوون کە گوتیان : ملائیکەتەکان کچانی خودان. بەڵام ئێمە هەرگیز نەمانگوتووە شێخ عبدالقادری گەیلانی کوڕی خودایە ، بە کەسی دیکەشمان نەگوتووە فلاَن کوڕی خودایە.

فَالْجَوَابُ : أنَّ نِسْبَةَ الْوَلَدِ إِلَى اللَّهِ كُفْرٌ مُسْتَقِلٌ ، قَالَ اللَّهُ تَعَالَى { قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ ، اللَّهُ الصَّمَدُ } ، وَالأَحَدُ : الَّذِي لا نَظِيرَ لَهُ . والصَّمَدُ : الْمَقْصُودُ فِي الْحَوَائِجِ . فَمَنْ جَحَدَ هَذَا فَقَدْ كَفَرَ وَلَوْ لَمْ يَجْحَدْ السُّورَةِ .

وەڵامی ئەمەش بەمجۆرەیە :

یەکەم : دیارە کە هەر کەس بڵێت خودا مناڵی هەیە ، ئەمە کوفرێکە بە تەنها هەر خۆی سەربەخۆیە . الله فەرمویەتی :{ قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ ، اللَّهُ الصَّمَدُ }

واتە : بڵێ : الله تاك و تەنهایە ، ئەگەر گوترا لە چیدا تەنهایە دەڵێین:

لە زاتی خۆیدا تەنهایە واتە هیچ کەسی نییە ،

تەنهایە لە صیفەتەکانیدا ، واتە: ئەو صیفەتانەی کە ئەو هەیەتی هیچ کەس نییەتی،

تەنهایە لە ناوەکانیدا واتە : ئەو ناوانەی کە ئەو هەیەتی هیچ کەس نییەتی ،

{ اللَّهُ الصَّمَدُ } واتە : تەنها الله جێی نیازە کە پێویستیەکانمان بۆ بهێنێتە دی.

جا هەر کەس ئینکاری لەمە بکات ئەوە کافر دەبێت، با ئینکاری لەوەش نەکات کە خودا لە ئەخیری سورەتەکەدا فەرمویەتی: کەسی لێ نەبووە و کەسی لێ نابێت

وَقَالَ اللَّهُ تَعَالَى ﴿ مَا ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ مِن وَلَدٍ وَمَا كَانَ مَعَهُۥ مِنْ إِلَٰهٍ ﴿٩١﴾ ﴾ المؤمنون
فَفَرَّقَ بَيْنَ النَّوْعَيْنِ ، وَجَعَلَ كُلاً مِنْهُمَا كُفْراً مُسْتَقِلاً
وَقَالَ تَعَالَى ﴿ وَجَعَلُواْ لِلَّهِ شُرَكَآءَ ٱلْجِنَّ وَخَلَقَهُمْ وَخَرَقُواْ لَهُۥ بَنِينَ وَبَنَٰتٍ بِغَيْرِ عِلْمٍ سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿١٠٠﴾ ﴾ الأنعام ، فَفَرَّقَ بَيْنَ كُفْرَيْنِ .
وَالدَّلِيلُ عَلَى هَذَا أَيْضاً أَنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا بِدُعَاءِ اللاتِّ – مَعَ كَوْنِهِ رَجُلاً صَالِحاً – لَمْ يَجْعَلُوهُ ابْنَ اللَّهِ. وَالَّذِينَ كَفَرُوا بِعِبَادَةِ الْجِنِّ لَمْ يَجْعَلُوهُمْ كَذَلِكَ .

**وەڵامی دووەم : خودا فەرمویەتی:( خودا هیچ منالێکی بۆ خۆی دانەناوە ، لەگەڵ ئەویشدا هیچ پەرستراوێکی دیکە نییە). ئەوەتە هەردوو نەوعە کوفرەکەی جیا کردووەتەوە . هەریەك لەوانەی کردووە بە کوفرێکی سەربەخۆ**

**وە فەرمویەتی: { وَجَعَلُوا لِلَّهِ شُرَكَاءَ الْجِنَّ وَخَلَقَهُمْ وَخَرَقُوا لَهُ بَنِينَ وَبَنَاتٍ بِغَيْرِ عِلْمٍ }**

**واتە :( ئەو کافرانە شەریکیان بۆ خودا داناوە کە جنۆکەن، یان جنۆکەیان کردووە بە شەریکی الله بەوەی کە عیبادەتەکان بۆ ئەوان ئەنجام دەدەن، لە هەمان کاتدا خۆیان دەزانن کە خودا ئەوانەی دروستکردووە ، وە بە درۆ و بوهتانەوە کچ و کوڕیان بۆ خودا داناوە. ئەوانە ئەو کار و کردەوەیان بە ئەوپەڕی نەفامی و بێ عیلمیەوە ئەنجامیان داوە)**

**سەرنج بدە خودا هەردوو نەوعە کوفرەکەی بە جیا باس کردووە ، کە یەکیان شەریك دانانە بۆ خودا و دووەمیان دانانی کوڕ و کچە بۆ خودا**

**وەڵامی سێهەم : ئەوانەی کە کافر بوون بەوەی کە (لات)یان دەپەرست کە پیاوچاکێك بووە، نەیاندەگوت (لات) کوڕی خودایە ، ئەوانەش کە بە هۆی جنۆکە پەرستنەوە کافربوون ، جنۆکەکانیان بە کوڕ و کچی خودا نەزانیوە.**

وَكَذَلِكَ أَيْضاً الْعُلَمَاءُ وَجَمِيعُ الْمَذَاهِبِ الأَرْبَعَةِ يَذْكُرُونَ فِي بَابِ (حكْمِ الْمُرْتَدِّ) أَنَّ الْمُسْلِمَ إِذَا زَعَمَ أنَّ لِلَّهِ وَلَدًا فَهُوَ مُرْتَدّ ، وِإِنْ أَشْرَكَ بِاللَّهِ فَهُوَ مُرْتَدٌ فَيُفَرِّقُونَ بَيْنَ النَّوْعَيْنِ . وَهَذَا في غَايَةِ الْوُضُوحِ

**وەڵامی چوارەم : هەروەها هەموو زانایان ، و هەر چوار مەزهەبەكە لە باسی حوكمی مورتەدا باسی ئەوەیان كردووە : ئەگەر موسڵمانێ گوتی خودا مناڵی هەیە ، ئەوە مورتەد بووەتەوە و لە دین هەڵگەڕاوەتەوە ، وە ئەگەر شەریكی بۆ خودا دانا ئەوە مورتەد بووەتەوە ، زانایان هەردوو جۆرەكەیان بە جیا داناوە ، ئەم مەسەلەیش یەكجار ڕۆشن و ئاشكرایە.**

# شوبهەی هەشتەم :

وَإِنْ قَالَ : { أَلا إِنَّ أَوْلِيَاءَ اللَّهِ لا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلا هُمْ يَحْزَنُونَ } يونس :٦٢

ئەگەر گوتی خودا فەرموویەتی :{ أَلا إِنَّ أَوْلِيَاءَ اللَّهِ لا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلا هُمْ يَحْزَنُونَ } واتە :( ئەولیاكانی خودا هیچ ترسێكیان لەسەر نییە و غەمباریش نابن ) تەواو مەبەستی موشریك ئەوەیە مادام ئەولیاكان غەمبار نابن ، ئەگەر ئێمە داوای هەرچییەك لە ئەولیاكان بكەین ، ئەوا خودا ئەو داواكاریانەمان دێنێتە دی بۆ ئەوەی ئەولیاكان غەمبار نەبن.

فَقُلْ : هَذَا هُوَ الْحَقُّ ، وَلكِنْ لا يُعْبَدُونَ . وَنَحْنُ لمْ نُنْكِرُ إِلاَّ عِبَادَتَهُمْ مَع اللَّهِ ، وَشركهُمْ مَعَهُ . وَإِلاَّ فَالَوَاجِبُ عَلَيْكَ حُبُّهُمْ ، وَاتِّبَاعُهُمْ ، وَالإِقْرَارُ بِكَرَامَاتِهِمْ .

تۆش لە وەڵامدا بڵێ :( ئەمە ڕاستە كە ئەولیاكان ترسیان لە سەر نییە و غەمبار نابن. بەڵام ئەولیاكان دەبێت خۆیان عیبادەت بكەن نەك عیبادەتیان بۆ بكرێت ، ئێمە تەنها ئینكاری لەوە دەكەین كە لەگەڵ پەرستنی خودادا ئەوانیش بپەرسترێن ، بكرێن بە شەریك و هاوبەشی خودا . واجبیشە لەسەرت كە ئەوانت خۆش بوێت ، و شوێنیان بكەویت لە كردەوە چاكەكانیاندا ، و دان بنێیت بە كەراماتەكانیاندا.

وَلاَ يَجْحَدُ كَرَامَاتِ الأَوْلِيَاءِ إِلاَّ أَهْلُ الْبِدَع وَالضَّلاَلاَتِ .
وَدِينُ اللَّهِ وَسَطٌ بَيْنَ طَرَفَيْنِ ، وَهُدَىً بَيْنَ ضَلاَلَتَيْنِ ، وَحَقٌّ بَيْنَ بَاطِلَيْنِ

هیچ كەس ئینكاری لە كەراماتی ئەولیاكان ناكات ، مەگەر ئەوانەی كە لەسەر ڕێبازی بیدعە و گومڕایین . دینی خوداش میانەڕەوییە لە نێوان دوو لایەنی زیادەڕەوی و كەمڕەوی ( كە یەكیان ئەولیاپەرستیە و یەكیان ئینكاری كردنی كەراماتی ئەولیاكانە ) دینی خودا هیدایەتە لە نێوان دوو گومڕاییدا ، حەق و ڕاستیە لە نێوان دوو ناحەقیدا .

فَإِذَا عَرَفتَ أنَّ هَذَا الَّذِي يُسَمِّيهُ الْمُشْرِكُونَ فِي زَمَانِنَا (الاعْتِقَادَ) هُوَ الشِّرْك الَّذِي أُنْزِلَ فِيهِ الْقُرْآنُ ، وَقَاتَلَ رَسُولُ اللَّه صلى الله عليه وسلم النَّاسَ عَلَيْهِ

**جا كە زانیت ئەو كارەی كە موشریكەكانی ئەم زەمانە (واتە زەمانی شێخ محمد) پێی دەڵێن : (عەقیدە پێ بوون) لای خۆشمان لە كوردستان پێی دەڵێن : عاقیە بوون بە شێخ و ئەولیاكان. ئەوە هەمان ئەو شیركەیە كە قورئانی لەبارەوە دابەزیوە و ، پێغەمبەریش لەسەر ئەوە دژی خەڵكی جەنگاوە.**

فاعْلَمْ أنَّ شِرْكَ الأَوَّلِينَ أخفُّ مِنْ شِرْكِ أهْلِ زمننا بِأَمرِيْنِ :
أَحَدُهُمَا : أَنَّ الأَوَّلِينَ لاَ يُشْرِكُونَ ، وَلاَ يَدْعُونَ الْمَلاَئِكَةَ ، والأَوْلِيَاءَ ، والأَوْثَانَ مَع اللَّهِ إِلاَّ فِي الرَّخَاءِ . وَأَمَّا في الشِّدَّةِ فَيُخْلِصُونَ لِلَّهِ الدين (الدعاء) ،

**ئنجا بزانە كە شیركی كافرەكانی سەردەمی پێغەمبەر سوكترە ، لە شیركی خەڵكی ئەم زەمانە ، لە دوو لایەنەوە :**

**<u>یەكیان</u> : ئەوەیە كە ئەو موشریكانەی كۆن كە شەریكیان بۆ خودا دادەنا و داوایان لە مەلائیكەتەكان و ئەولیاكان و بتەكان دەكرد تەنها لە كاتی خۆشی و ئارامیدا ئەو كارانەیان دەكرد. بەڵام لە كاتی ناخۆشی و سەختی و تەنگانەدا ، تەنها لە خودایان داوا دەكرد و تەنها لەو دەپاڕانەوە و تەنها ئەویان دەپەرست.**

**جا بۆ سەلماندنی ئەم مەسەلەیە دانەر چوار ئایەتی هێناوە :**

كَمَا قَالَ تَعَالَى :{ وَإِذَا مَسَّكُمْ الضُّرُّ فِي الْبَحْرِ ضَلَّ مَنْ تَدْعُونَ إِلاَّ إِيَّاهُ فَلَمَّا نَجَّاكُمْ إِلَى الْبَرِّ أَعْرَضْتُمْ وَكَانَ الإِنْسَانُ كَفُورًا } الإسراء ٦٧

**<u>ئایەتی یەكەمیان</u> : ئەوەیە كە خودای بڵند فەرمویەتی :( كاتێ توشی حاڵێكی خراپ دەبن كە (مەترسی خنكانە لە بەحردا ). هەموو ئەوانەی كە ئێوە هاوارتان بۆ دەبردن و داواتان لێدەكردن نە لە دڵتاندا دەمێنن و نە لەسەر زمانتان جگە لە ناوی الله كە تەنها هاوار لەو دەكەن و شەریكی بۆ دانانێن . بەڵام هەر كە خودا ئێوەی نەجات دا و ئێوەی گەیاندە وشكانی پشتان كردە ئەو**

یەکخوداپەرستیەی کە لە بەحردا فێری بوون . ئینسانەکانیش صیفەتیان وایە کە زۆر کوفر و بیٚ ئیمانی دەکەن.

وقوله : ﴿ قُلْ أَرَءَيْتَكُمْ إِنْ أَتَىٰكُمْ عَذَابُ ٱللَّهِ أَوْ أَتَتْكُمُ ٱلسَّاعَةُ أَغَيْرَ ٱللَّهِ تَدْعُونَ إِن كُنتُمْ صَـٰدِقِينَ ﴿٤٠﴾ بَلْ إِيَّاهُ تَدْعُونَ فَيَكْشِفُ مَا تَدْعُونَ إِلَيْهِ إِن شَآءَ وَتَنسَوْنَ مَا تُشْرِكُونَ ﴿٤١﴾ ﴾الأنعام

ئایەتی دووەمیان : خودا فەرمویەتی: (بڵیٚ : ئەی موشریکەکان ، ئادەی پێم بڵێن ئەگەر عەزابی ئەڵڵاتان بۆ هات یان کاتیٚ قیامەت بە سەرتاندا هات ، ئایە ئێوە لە غەیری خودا داوا دەکەن ( کە ئەو عەزابەتان لەسەر لابەرێت ) ، (دەی وەڵامم بدەنەوە) ئەگەر ڕاست دەکەن (کە دەڵێن لەگەڵ خودادا کەسی دیکەش هەیە شایەنی پەرستن بێت)

بەڵکو : ئەی کافرەکان تەنها لە خودا داوا دەکەن کە ئەو عەزابەتان لەسەر لابدات و ئەویش لەسەرتانی لادەدات ئەگەر بیەوێت. ئێوەش هەموو ئەو ئەولیاو پیاوچاکانە لەبیر دەکەن کە داواتان لێدەکردن و هاوارتان بۆ دەبردن بەوەش ئەوانتان کردبوو بە شەریکی خودا .

وقوله:﴿ وَإِذَا مَسَّ ٱلْإِنسَـٰنَ ضُرٌّ دَعَا رَبَّهُۥ مُنِيبًا إِلَيْهِ ثُمَّ إِذَا خَوَّلَهُۥ نِعْمَةً مِّنْهُ نَسِىَ مَا كَانَ يَدْعُوٓا۟ إِلَيْهِ مِن قَبْلُ وَجَعَلَ لِلَّهِ أَندَادًا لِّيُضِلَّ عَن سَبِيلِهِۦ ۚ قُلْ تَمَتَّعْ بِكُفْرِكَ قَلِيلًا ۖ إِنَّكَ مِنْ أَصْحَـٰبِ ٱلنَّارِ ﴿٨﴾ ﴾ الزمر

ئایەتی سێیەم : واتە :(کاتیٚ ئینسان توشی حاڵێکی خراپ دەبێت ، هاوار لە پەروەردگاری دەکات و دەگەڕێتەوە بۆ لای. پاشان کاتیٚ کە خودا نیعمەتێکی پێدا و کەوتە خۆشیەوە ، ئەوە لەبیر دەکات کە لە پێش ئەمەدا تەنها هاواری لە خودا دەکرد کە لە تەنگانە ڕزگاری بکات، لەگەڵ ئەوەشدا هاوتا بۆ خودا دادەنێت، و سەرەنجام لە ڕێگەی خودا لادەدات. تۆش پێی بڵیٚ: کەمێك سەلامەتی بچێژە لەگەڵ کوفرەکەتا چونکە تۆ بە هەمیشەیی دەبیت بە هاوەڵی ئاگری جەهەننەم)

وقوله :{ وَإِذَا غَشِيَهُمْ مَوْجٌ كَالظُّلَلِ دَعَوْا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ } لقمان : ٣٢

ئایەتی چوارەم : واتە :( كاتیٚ ئەو موشریكانە شەپۆلی دەریا وەك هەورەكان دایاندەپۆشێت ، یەكسەر واز لە شیرك دەهێنن و تەنها هاوار بۆ خودا دەبەن و داوا لە خودا دەكەن و دەبن بە یەكخوداپەرست و هەموو عیبادەتەكان تەنها بۆ خودا ئەنجام دەدەن بە پوختی)

فَمَنْ فَهِمَ هَذِهِ الْمَسْأَلَةَ الَّتِي وَضَّحَهَا اللَّهُ في كِتَابِهِ ، وَهِيَ أَنَّ الْمُشْرِكِينَ الَّذِينَ قَاتَلَهُمْ رَسُولُ اللَّه صلى الله عليه وسلم يَدْعُونَ اللَّهَ ، وَيَدْعُونَ غَيْرَهُ في الرَّخَاءِ

جا هەركەس لەم مەسەلەیە تێبگات، كە خودا لە كتێبەكەیدا ڕوونی كردوەتەوە، ئەمەش ئەوەیە : ئەو موشریكانەی كە پێغەمبەری خودا ﷺ جەنگی بەرپا كرد لە دژیان ، خودایان دەپەرست و غەیری خوداشیان دەپەرست ، ئەمە لە كاتی خۆشیدا.

وَأَمَّا فِي الضراء والشِّدَّةِ فَلاَ يَدْعُونَ إِلاَّ اللَّهَ وَحْدَهُ لا شريك له وَيَنْسَوْنَ سَادَاتِهِمْ تَبَيَّنَ لَهُ الْفَرْقُ بَيْنَ شِرْكِ أَهْلِ زَمَانِنَا، وَشِرْكِ الأَوَّلِينَ وَلَكِنْ أَيْنَ مَنْ يَفْهَمُ قَلْبُهُ هَذِهِ الْمَسْأَلَةَ فَهْماً رَاسِخًا ، وَاللَّهُ الْمُسْتَعَانُ .

بەڵام لە كاتی تەنگانە و ناخۆشیدا تەنها خودایان دەپەرست و داوایان لە هیچ كەس نەدەكرد جگە لە الله، لە داوا و پاڕانەوەكاندا هیچ كەسیان نەدەكرد بە شەریكی. وازیان لە ئەولیا و سەیدەكانیان دەهێنا – جا هەر كەسێك لەم مەسەلەیە حاڵی بوو – ئەوا بۆی ئاشكرا دەبێت كە چی جیاوازیەكی گەورە هەیە لە نێوان شیركی خەڵكی ئەم زەمانە و شیركی ئەوانەی سەردەمی پێغەمبەرﷺ . بەڵام ئەو كەسە لە كوێیە كە لەم مەسەلەیە بە جوانی حاڵی ببێت. ( وە بزانێت كە ئەو موشریكانەی سەردەمی زوو كۆتاییان نەهاتووە بەڵكو كەسانێكی لە خۆیان خراپتریان لە پاش بە جیٚ ماوە )

الأَمْرُ الثَّانِي : أَنَّ الأَوَّلِينَ يَدْعُونَ مَع اللَّهِ أُنَاسًا مُقَرَّبِينَ عِنْدَ اللَّهِ : إِمَّا نَبِيًّا ، وإِمَّا وَلِيًّا ، وَإِمَّا مَلاَئِكَةً . أَوْ يَدْعُونَ أَشْجَاراً أو أَحْجَاراً مُطِيعَةً للِّهِ ، لَيْسَتْ عَاصِيَةً .

جیاوازی دووەم : موشریکەکانی زوو لەگەڵ خوداپەرستیدا داوایان لە کەسانێك دەکرد کە نزیك بوون لە خوداوە ، یان پێغەمبەر بوون یان ئەولیا یان مەلائیکەت بوون ، یان ئەوە بوو داوایان لە دار و بەرد دەکرد ، کە ئەو کەسانە و ئەو دار و بەردانە گوێڕایەڵی خودا بوون ، لە خودا یاخی نەبوون.

| |
|---|
| وَأَهْلُ زَمَانِنَا يَدْعُونَ مَع اللَّهِ أُنَاسًا مِنْ أَفْسَقِ النَّاسِ ، وَالَّذِينَ يَدْعُونَهُمْ هُم الَّذِينَ يَحْكُونَ عَنْهُم الْفُجُورَ مِن الزِّنَا ، وَالسَّرِقَةِ ، وَتَرْكِ الصَّلاَةِ ، وَغَيْرِ ذَلِكَ . |

بەڵام موشریکەکانی ئەم زەمانە لەگەڵ ئەوەدا کە خوداپەرستی دەکەن ، دەڕۆن لە جۆرە کەسانێك دەپاڕێنەوە و داوای پێویستیەکانیان لێدەکەن و عیبادەتیان بۆ دەکەن ، کە ئەو بە حساب پیاوچاکانە ، لە هەموو خەڵکی خراپترن ( هەیانە بە حسابی خۆیان ئەوەندەیان عیبادەت کردووە گەیشتوونە پلەیکی بەرز کە هیچ واجباتێکی دینیان لەسەر نەماوە و پێویست ناکات خودا بپەرستن)
ئەوانەش کە عیبادەتیان بۆ دەکەن هەر خۆیان دەگێڕنەوە کە شێخ و ئەولیاکانیان : زینا دەکەن و دزی دەکەن و نوێژ ناکەن و ، چەندەها شتی خراپی دیکەش لە بارەیانەوە دەگێڕنەوە.

| |
|---|
| وَالَّذِي يَعْتَقِدُ فِي الصَّالِحِ ، أو الَّذِي لاَ يَعْصِي مِثْلِ الْخَشَبِ وَالْحَجَرِ أَهْوَنُ مِمَّنْ يَعْتَقِدُ فِيمَنْ يُشَاهَدُ فِسْقُهُ وَفَسَادُه ، وَيُشْهَدُ بِهِ |

جا ئەو کەسەی کە عەقیدەی بە پیاوچاکێك هەبێت ، یان عەقیدەی بەشتێ ببێت کە ئەو شتە لە خودا یاخی نابێت ، وەك دار و بەرد ، ئەمە گوناهەکەی سوکترە لەو کەسەی کە عەقیدەی بە کەسێك ببێ، کە بە ئاشکرا فەساد و خراپەکانی ببینرێت ، شایەدیشی لەسەر بدرێت. ( ئەگەر چی هەدووکیان هەر موشریکن)

# شوبهەی نۆیەم: دەڵێن هەر کەس گوتی لاإله إلا الله، بە هیچ شتێ کافر نابێت

إِذَا تَحَقَّقْتَ أَنَّ الَّذِينَ قَاتَلَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم أَصَحُّ عُقُولاً وَأَخَفُّ شِرْكاً مِنْ هَؤُلاَءِ : فَاعْلَمْ أَنَّ لِهَؤُلاَءِ شُبْهَةً يُورِدُونَهَا عَلَى مَا ذَكَرْنَا وَهِي مِنْ أَعْظَمِ شُبَهِهِمْ ، فَاصْغِ سَمْعَكَ لِجَوَابِهَا :

**مادام لەوەدا کە باسمان کرد بۆت دەرکەوت کە ئەوانەی پێغەمبەر ﷺ جەنگی بەرپاکرد لە دژیان عاقڵتر بوون لەم موشریکانەی ئێستا و شیرکەکەیان لە شیرکی ئەمانەی ئێستا سوکتر بووە : ئنجا بزانە کە ئەوانە شوبهەیەکیان هەیە ، دەیهێنن بە سەر ئەوانەدا کە باسمان کرد ، ئەم شوبهەیەش گەورەترین شوبهەی ئەوانە ، دەی تۆش جوان گوێ بگرە بۆ وەڵامەکەی.**

وَهِي أَنَّهُمْ يَقُولُونَ : إِنَّ الَّذِينَ نَزَلَ فِيهِمُ الْقُرْآنُ لاَ يَشْهَدُونَ أَنْ لا إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ ، وَيُكَذِّبُونَ الرَسُولَ صلى الله عليه وسلم وَيُنْكِرُونَ الْبَعْثَ ، وَيُكَذِّبوْنَ الْقُرْآنَ ، وَيَجْعَلُونَهُ سِحْرًا .
وَنَحْنُ نَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ ، وَنُصَدِّقُ الْقُرْآنَ ، ونُؤْمِنُ بِالْبَعْثِ ، وَنُصَلِّي ، وَنَصُومُ ، فكَيْفَ تَجْعَلُونَنَا مِثْلَ أولئِكَ ؟

**ئەوەش ئەوەیە کە دەڵێن : ئەوانەی کە قورئان لە بارەیانەوە دابەزیوە شایەدی نادەن بە (لاإله إلا الله)، پێغەمبەر ﷺ بە ڕاست نازانن ، ئینکاری لە زیندوو بوونەوە دەکەن ، قورئان بە درۆ دەزانن ، و بە سیحری دەزانن .**
**بەڵام ئێمە لەوان جیاوازین ئەوەتە ئێمە شایەدی دەدەین بە ( لا إِلَهَ إِلاَّ اللَّه) وە شایەدی دەدەین بە محمد ﷺ کە ڕەوانەکراوی خودایە ، ئێمە قورئان بە ڕاست دەزانین ، و باوەڕمان بە زیندوبوونەوە هەیە ، نوێژ دەکەین ، ڕۆژوو دەگرین ،**

چۆن ئێمە دەخەنە ڕیزی ئەوانەوە ؟ هەر بەوەش وازتان نەهێناوە ، بەڵكو ئێمە لەوانیش بە خراپتر دەزانن.

فَالْجَوَابُ : أَنَّهُ لاَ خِلاَفَ بَيْنَ الْعُلَمَاءِ كُلِّهِمْ أنَّ الرَّجُلَ إِذَا صَدَّقَ رَسُولَ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم فِي شَيْءٍ ، وَكَذَّبَهُ في شَيْءٍ أَنَّهُ كَافِرٌ لَمْ يَدْخُلْ فِي الإِسْلاَمِ .
وَكَذَلِكَ إِذَا آمَنَ بِبَعْضِ الْقُرْآنِ ، وَجَحَدَ بَعْضَهُ ، كَمَنْ أَقَرَّ بِالتَّوْحِيدِ ، وَجَحَدَ وُجُوبَ الصَّلاَةِ ،
أَوْ أقَرَّ بِالتَّوْحِيدِ ، وَالصَّلاَةِ ، وَجَحَدَ وُجُوبَ الزَّكَاةِ ،
أَوْ أَقَرَّ بِهَذَا كُلِّهِ وَجَحَدَ الصَّوْم ، أَوْ أَقَرَّ بِهَذَا كُلِّهِ ، وَجَحَدَ الْحَج . وَلَمَّا لَمْ يَنْقَدْ أنَاسٌ فِي زَمَنِ النَّبِيِّ صلى الله عليه وسلم لِلحَجِّ أَنْزَلَ اللَّهُ فِي حَقِّهِمْ ﴿ وَلِلَّهِ عَلَى ٱلنَّاسِ حِجُّ ٱلْبَيْتِ مَنِ ٱسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلًا ۚ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِيٌّ عَنِ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٩٧﴾ ﴾ آل عمران

وەڵامی یەکەم : ئەوەیە کە هیچ جیاوازیەك نییە لە نێوان تەواوی زانایاندا :

– کە هەر کەسێك ، پێغەمبەر ﷺ بە ڕاست بزانێت لە شتێکدا (یان لە هەزار شتا بە ڕاستی بزانێت) و پاشان بە درۆی بخاتەوە لە تەنها یەك شتا ، ئەوا ئەو کەسە کافرە و نەهاتوەتە ناو ئیسلامەوە .

– هەروەها ئەگەر باوەڕی هێنا بە هەندێك لە قورئان و ئینکاری لە بەشێکی تری کرد ، (هەمان حوکمی هەیە)

– نمونەیەکی دیکە : وەك ئەو کەسەی کە دان دەنێت بە تەوحیدا و ئینکاری لەوە بکات کە نوێژ واجبە (با خۆیشی نوێژ بکات هەمان حوکمی هەیە)

– نمونەیەکی دیکە : ئەگەر دانی نا بە تەوحید و بە نوێژا ، بەڵام ئینکاری لەوە کرد کە زەکات واجب بێت .

– نمونەیەکی دیکە: ئەگەر دانی نا بە هەموو ئەوانەدا، بەڵام ئینکاری لە ڕۆژوو کرد

**– نمونەیەكی دیكە : ئەگەر دانی نا بە هەموو ئەوانەدا و ئینكاری لە حەجی ماڵی خودا كرد ( با خۆیشی حەج بكات هەمان حوكمی هەیە)**

**ئەوە بوو كەسانێك لە زەمانی پێغەمبەردا ملكەچ نەبوون بۆ حەج ، خودا لەبارەی ئەوانەوە ئەو ئایەتەی دابەزاند :**

﴿ وَلِلَّهِ عَلَى ٱلنَّاسِ حِجُّ ٱلْبَيْتِ مَنِ ٱسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلًا ۚ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِىٌّ عَنِ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٩٧﴾ ﴾

**واتە :( عیبادەتكرنی خودا بە تەنها واجبە لە سەر تەواوی خەڵكی، بەوەی كە حەجی ماڵی خودا بكەن ، ئەمەش لەسەر ئەو كەسانەیە كە توانایان هەیە ئەو ڕێگایە ببڕن ، جا هەركەس كافر بێت (واتە : باوەڕی نەبێت بە واجب بوونی ) ئەوا خودا هیچ موحتاجی دروستكراوەكانی نییە)**

وَمَنْ أَقَرَّ بِهَذَا كُلِّهِ ، وَجَحَدَ الْبَعْثَ كَفَرَ بِالإِجْمَاعِ ، وَحَلَّ دَمُهُ ، وَمَالُهُ كَمَا قَالَ تَعَالَى ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكْفُرُونَ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ وَيُرِيدُونَ أَن يُفَرِّقُوا۟ بَيْنَ ٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ وَيَقُولُونَ نُؤْمِنُ بِبَعْضٍ وَنَكْفُرُ بِبَعْضٍ وَيُرِيدُونَ أَن يَتَّخِذُوا۟ بَيْنَ ذَٰلِكَ سَبِيلًا ﴿١٥٠﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ حَقًّا ۚ وَأَعْتَدْنَا لِلْكَٰفِرِينَ عَذَابًا مُّهِينًا ﴿١٥١﴾ ﴾ النساء فَإِذَا كَانَ اللَّهُ قَدْ صَرَّحَ فِي كِتَابِهِ أَنَّ مَنْ آمَنَ بِبَعْضٍ ، وَكَفَرَ بِبَعْضٍ فَهُوَ كَافِرٌ حَقًا وأنه يستحق ما ذكر زَالَتْ هَذِهِ الشُّبْهَةُ .
وَهَذِهِ هِي التي ذَكَرَهَا بَعْضُ أَهْلِ الأَحْسَاءِ فِي كِتَابِهِ الَّذِي أرْسَلَه إِلَيْنَا.

**– نمونەیەكی دیكە: هەركەس دان بنێت بە هەموو ئەوانەدا كە باسمان كرد ، بەڵام ئینكاری لە زیندوو بوونەوە بكات، بە ئیجماعی تەواوی زانایان كافر دەبێت و خوێن و ماڵی حەڵاڵ دەبێت . هەر وەك خودا فەرمویەتی:**

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكْفُرُونَ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ ﴾ **تا كۆتایی واتە :**

**( ئەوانەی كوفر و بیٚ باوەڕی دەكەن بە خودا و بە پێغەمبەرەكانی و دەڵێن ئیمان دەهێنین بە هەندێك لە پێغەمبەرەكان و ئیمان ناهێنین بە هەندێكیان، وە دەیانەوێت لەم ناوەندەدا ڕێگایەك هەڵبژێرن، ئائەوانە كافری تەواون و ئەو**

پەڕی کافرن) جا کە خودا لە کتێبەکەیدا بە ئاشکرا باسی ئەوەی کردووە کە هەرکەس ئیمان بهێنێت بە هەندێکی و کوفر بکات بە هەندێکی ، ئەوە کافری تەواوە ......ئەوا ئەم شوبهەیە دەڕەوێتەوە ، ئەمەش هەمان ئەو شوبهەیە کە هەندێك لە ئەهلی ئیحساء ، لەو نامەیەدا کە بۆمانی ناردبوو باسی کرد بوو.

وَيُقَالُ أيضا : إِذَا كُنْتَ تُقِرُّ أنَّ مَنْ صَدَّقَ الرَّسُولَ صلى الله عليه وسلم فِي كل شَيءٍ ، وَجَحَدَ وُجُوبَ الصَّلاَة إنه كَافِرٌ حَلاَلُ الدَّمِ وَالْمَالِ بِالإِجْمَاعِ ،
وَكَذَلِكَ إِذَا أَقَرَّ بِكُلِّ شَيءٍ إِلاَّ الْبَعْثَ وَكَذَلِكَ لَوْ جَحَدَ وَجُوبَ صَوْمِ رَمَضَانَ ، وصدّق بذلك كله ، وَلاَ تَخْتَلِفُ الْمَذَاهِبُ فِيهِ ، وَقَدْ نَطَقَ بِهِ الْقُرْآنُ كَمَا قَدَّمْنَا

وەڵامی دووەم : ئەگەر تۆ دانت بەوەدا نا کە هەر کەسێك باوەڕ بە پێغەمبەر بکات ﷺ لە هەموو شتەکاندا ، بەڵام ئینکاری لەوە بکات کە نوێژ واجب بێت، ئەوا ئەو کەسە کافرە و خوێن و ماڵی حەڵاڵە، ئەمە بە یەکدەنگی هەموو مەزهەبەکان و هەموو زانایان.

– هەروەها نمونەیەکی دیکە: ئەگەر دانی نا بە هەموو شتەکانا، بەڵام ئینکاری لە زیندوو بوونەوەی دوای مردن کرد هەمان حوکمی هەیە ،

– هەروەها ئەگەر ئینکاری لە واجب بوونی ڕۆژووی ڕەمەزان بکات ، هەموو دینیش بە ڕاست بزانێت هەر هەمان حوکمی هەیە ، لەم بارەیەشەوە هیچ کام لە مەزهەبەکان ناکۆك نین ، قورئانیش لە بارەی هەمان شتەوە دواوە ، هەر وەك لە پێشدا باسمان کردووە.

فَمَعْلُومٌ أَنَّ التَّوْحِيدَ هُوَ أعْظَمُ فَرِيضَةٍ جَاءَ بِهَا النَّبِيُّ صلى الله عليه وسلم
وَهُوَ أَعْظَمُ مِن الصَلاَةِ ، والزَّكَاةِ ، وَالصَّوْمِ ، وَالْحَجِّ . فَكَيْفَ إِذَا جَحَدَ الإِنْسَانُ شَيْئاً مِنْ هَذِهِ الأُمُورِ كَفَرَ وَلَوْ عَمِلَ بِكُلِّ مَا جَاءَ بِهِ الرَّسُولُ صلى الله عليه وسلم ؟ وَإِذَا جَحَدَ التَّوْحِيدَ الَّذِي هُوَ دِينُ الرُّسُلِ كُلِّهِمْ لاَ يَكْفُرُ ؟! سُبْحَانَ اللَّهِ مَا أَعْجَبَ هَذَا الْجَهْلِ !

**ئینجا مەعلومە كە تەوحید گەورەترین واجبە كە پێغەمبەر ﷺ هێناویەتی، تەوحید گەورەترە لە نوێژ و زەكات و ڕۆژوو گرتن و حەجكردن.**

**دەی چۆن ئەگەر ئینسان ئینكاری هەر یەكێ لەو شتانە بكات ، كافر دەبێت ، با كاریش بكات بە گشت ئەو شتانەی كە پێغەمبەر ﷺ هێناویەتی؟**

**بەڵام ئەگەر ئینكاری لە تەوحید بكات كە دینی هەموو پێغەمبەرانە، ئەی ئەمەیان چۆن كافر نابێت ، (سبحان الله) ئەم جەهل و نەفامیە چەندە عەجیبە ؟**

| |
|---|
| وَيُقَالُ أَيْضًا لِهَؤُلاَءِ : أَصْحَابُ رَسُولِ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم قَاتَلُوا بَنِي حَنِيفَةَ، وَقَدْ أَسْلَمُوا مَعَ النَّبِيِّ صلى الله عليه وسلم وَهُمْ يَشْهَدُونَ أَنْ لاإله إلا الله ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ الله وَيُؤَذِّنُونَ ، وَيُصَلُّونَ |

**<u>وەڵامی سێیەم</u> : ئەو ئەصحابانەی پێغەمبەر ﷺ جەنگیان لە دژی بەنو حەنیفە بەرپا كرد ، (كە ئەمانە عەشرەتێكی گەورەی عەرەب بوون و موسەیلەمەیان بە پێغەمبەر دەزانی) لەگەڵ ئەوەشدا ، چەندەها كردەوەی چاكیان هەبوو:**

**لەوانەش ئەوە بوو لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ موسڵمان بووبوون و ،**

**شایەدیان دەدا بە (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ ) وە شایەدیان دەدا كە محمد ﷺ ڕەوانەكراوی خودایە ، بانگیان دەدا و نوێژیشیان دەكرد.**

| |
|---|
| فَإِنْ قَالَ : إِنَّهُمْ يَشْهَدُونَ ، أَنَّ مُسَيْلِمَةَ نَبِيٌّ . قُلْنَا : هَذَا هُوَ الْمَطْلُوبُ : إِذَا كَانَ مَنْ رَفَعَ رَجُلاً إلى رُتْبَةِ النَّبِيِّ صلى الله عليه وسلم كَفَرَ ، وَحَلَّ مَالُهُ وَدَمُهُ ، وَلَمْ تَنْفَعْهُ الشَّهَادَتَانِ ، وَلا الصَّلاَةُ ، فَكَيْفَ بِمَنْ رَفَعَ (شَمْسَانَ) أَوْ (يُوسُفَ) ، أَوْ صَحَابِيًّا، أَوْ نَبِيًّا إلى مَرْتَبَةِ جَبَّارِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ ؟ سُبْحَان الله مَا أَعْظَمَ شَأْنَهُ { كَذَلِكَ يَطبَعُ اللَّهُ عَلَى قُلُوبِ الَّذِينَ لاَ يَعْلَمُونَ } الروم : ٥٩ |

**ئەگەر گوتی : ئەوان شایەتیان دەدا كە موسەیلەمە پێغەمبەرە ( لەبەر ئەوە بەكافر دانران)، ئێمەش دەڵێین ئەمە مەبەستەكەمانە، ئەگەر كەسێك پیاوێك بەرز بكاتەوە بۆ پلەی پێغەمبەر ﷺ ، ئەو كەسە بەم كارەی كافر ببێت ، ماڵ و خوێنیشی حەڵاڵ ببێت ، هەردوو شایەتومانەكەی ، هیچ سوودی نەبێت بۆی،**

**هەروەها نوێژەكانیشی سوودی نەبێت، ئەی ئەو كەسە ئەگەر شەمسان یان یوسف یان ئەصحابەیەك، یان پێغەمبەرێك بەرز بكاتەوە بۆ پلەی خودای ئاسمانەكان و زەمین، دەبێت حوكمی چی بێت ؟**

**( سبحان الله) كاری خودا چەندە گەورەیە**

**( بەم شێوەیە خودا مۆر دەدات لە دڵی ئەوانەی كە نازانن )**

وَيُقَالُ أَيْضًا : الَّذِينَ حَرَّقَهُمْ عَلِيُّ بْنُ أبي طَالِبٍ رضي الله عنه بِالنَّارِ كُلُّهُمْ يَدَّعُونَ الإِسْلاَمَ وَهُمْ مِنْ أَصْحَابِ عَلِيٍّ رضي الله عنه وَتَعَلَّمُوا الْعِلْمَ مِنَ الصَّحَابَةِ ،
وَلكِنِ اعْتَقَدُوا فِي عَلِيٍّ رضي الله عنه مِثْلَ الاعْتِقَادِ فِي (يُوسُفَ) ، وَ(شَمْسَانَ) وَأَمْثَالِهِمَا .
فَكَيْفَ أَجْمَعَ الصَّحَابَةُ عَلَى قَتْلِهِمْ ، وَكُفْرِهِمْ ؟
أَتَظُنُّونَ أنَّ الصَّحَابَةَ يُكَفِّرُونَ الْمُسْلِمِينَ ؟ أَمْ تَظُنُّونَ أنَّ الاعْتِقَاد في (تَاجٍ) وَأَمْثَالِهِ لاَ يَضُرُّ ، وَالاعْتِقَادُ فِي عَلِيِّ بْنِ أبي طَالِبٍ رضي الله عنه يُكَفِّرُ ؟

**وەڵامی چوارەم : ئەوانەی كە ئیمام عەلی كوڕی ئەبو تاڵب بە ئاگر سوتاندنی (چەندین چاكەی گەورە گەورەیان هەبوو لەو چاكانەیان) ئەوە بوو :**

- **هەموویان خۆیان بە موسڵمان دەزانی و ،**
- **ئەوانەش هەندێك بوون لە هاوەڵانی عەلی خودا لێی ڕازی بێت**
- **ئەوانە عیلمی شەرعیان لە ئەصحابەكانەوە وەرگرت بوو ،**

**بەڵام (خراپەیەكیان هەبوو كە) عەقیدەیان بە عەلی هەبوو ، وەك ئەو خەڵكەی ئەم سەردەمە (واتە سەردەمی شێخ محمد) باوەریان بە یوسف و شەمسان هاوشێوەكانیان هەیە .**

**سەیری هەموو ئەصحاب یەكدەنگ بوون لەسەر كوشتنیان و لەسەر بەكافر دانانیان؟ جا ئێوە سێ ڕێگەتان لە پێشە :**

**یەكەم : ئەوەیە ئێوە وا گومان دەبەن كە ئەصحابەكانیش موسڵمانان بە كافر دەزانن؟**

**دووەم: یان ئێوە وا گومان دەبەن کە عەقیدە بوون به (تاج) و هاوشێوەکانی زیانی نییە و عەقیدە بوون بە عەلی کوڕی ئەبو تالب موسڵمانی پیٚ کافر دەبێت؟**

**سێیەم : ئەوەیە کە دان بنێن بە حەقدا ، کە هەر کەسێك شەریکی بۆ خودا دانا ، نە شایەتومان و نە هیچ کام لە کردەوە چاکەکانی هیچ سودێکی نییە.**

وَيُقَالُ أَيْضًا : بَنُو عُبَيْدٍ الْقَدَّاحِ الَّذِينَ مَلَكُوا الْمَغْرِبَ وَمِصْرَ في زَمَنِ بَنِي الْعَبَّاسِ كُلُّهُمْ يَشْهَدُونَ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم ،
وَيَدَّعُونَ الإِسْلاَمَ ، وَيُصَلّوْنَ الْجُمُعَةَ ، وَالْجَمَاعَةَ .
فَلَمَّا أَظْهَرُوا مُخَالَفَةَ الشَّرِيعَةِ فِي أَشْيَاءَ دَوْنَ مَا نَحْنُ فِيهِ أَجْمَعَ الْعُلَمَاءُ عَلَى كُفْرِهِمْ ، وَقِتَالِهِمْ ، وَأَنَّ بِلادَهُمْ بِلادُ حَرْبٍ ،
وَغَزَاهُم الْمُسْلِمُونَ حَتَّى اسْتَنْقَذُوا مَا بأَيْدِيهِمْ مِنْ بُلْدَانِ الْمُسْلِمِينَ .

**وەڵامی پێنجەم : ئەوە بوو نەوەکانی عوبەید القداح ([2]) کە بوونە پادشا و کاربەدەستی مەغریب و میصر لە سەردەمی عەبباسیەکاندا، هەموویان شایەدیان دەدا بە (إِلَهَ إِلاَّ اللَّه) شایەدیشیان دەدا بەوەی کە محمد ﷺ ڕەوانەکراوی خودایە. خۆشیان بە ئەهلی ئیسلام دەزانی، نوێژی جومعە و جەماعەتیان دەکرد. هەر کە بە ئاشکرا لە شەریعەت لایاندا ، کە ئەو کارەی ئەوان کەمتریش بووە لەوەی کە لەم سەردەمەی ئێمەدا دەکرێت ، تەواوی زانایانی ئیسلام یەکدەنگ بوون لەسەر ئەوەی کە ئەوانە کافرن و بەرپاکردنی جەنگ لە دژیان واجبە. لەسەر ئەوەش یەکدەنگ بوون کە وڵاتەکەیان وڵاتی**

[2] ئەوانە بە درۆ و بوختانەوە خۆیان ناونابوو فاتمیەکان و لای هەندێ لە مێژوونوسان بە فاتمیەکان ناسراون، لە ڕاستیدا ئەوانە نەوەی یەهود و مەجوس بوون لە سەرەتای سەدەی سێەمی کۆچیدا سەریان هەڵدا ( ابن الجوزی ) نامەیەکی نوسی لە دژیان بە ناوی (النصر علی المصر ) ئەوە بوو بە دەستی صلاح الدین و سوپاکەی لەساڵی ٥٦٧ی هیجریدا تەفرو تونا کران الحمد لله.

جەنگە، موسڵمانانیش لەگەڵیان کەوتنە جەنگەوە، هەتا هەموو وڵاتەکانی موسڵمانەکانیان لە دەست سەندنەوە .

وَيُقَالُ أَيْضاً : إِذَا كَانَ الأَوَّلُونَ لَمْ يَكْفُرُوا إِلاَّ لأَنَّهُمْ جَمَعُوا بَيْنَ الشِّرْكِ وَتكْذِيبِ الرّسُولِ ، وَالْقُرْآنِ ، وَإِنْكَارِ الْبَعْثِ ، وَغَيْرِ ذَلِكَ فَمَا مَعْنَى البَابِ الَّذِي ذَكَرَهُ العُلَمَاءُ في كُلِّ مَذْهَبٍ : " بَابُ : حُكْمِ الْمُرْتَدِّ " وَهُوَ الْمُسْلِمُ الَّذِي يَكْفُرُ بَعْدَ إِسْلاَمِهِ .

وەڵامی شەشەم : ئەگەر کافرەکانی کۆن بە حسابی ئێوە ، تەنها بەوە کافر بوو بوون کە کۆمەڵێك کوفریان بەیەکەوە ئەنجام دابوو ( کە شەریکیان بۆ خودا دانا بوو، پێغەمبەر و قورئانیان بە درۆ زانیوە، و ئینکاری زیندوو بوونەوەیان کردووە ، چەندەها کوفری دیکەشیان کردووە ) ، ئەو هەموو کوفرەیان کردووە ئینجا بە کافر حسێب کراون ، جا ئەگەر وابێت ، ئەی ئەو باسانە مەعنای چییە کە زانایانی شەریعەت لە هەموو مەزهەبەکاندا باسیان کردووە لە کتێبەکانی شەریعەتدا بە ناوی (باب حكم المرتد) واتە :( باسی حوکمی هەڵگەڕاوە) ، کە پێناسەیان کردووە گوتویانە :(وَهُوَ الْمُسْلِمُ الَّذِي يَكْفُرُ بَعدَ إِسْلاَمِه) ئەو موسڵمانەیە کە لە دوای موسڵمان بوونی کافر دەبێتەوە.

ثُمَّ ذَكَرُوا أَنواعاً كَثِيرَةً ، كُلُّ نَوْعٍ مِنْهَا يُكَفِّرُ، وَيُحِلُّ دَمَ الرَّجُلِ وَمَالَهُ ، حتّى إِنَّهُمْ ذَكَرُوا أَشْيَاءَ يَسِيرَةً عِنْدَ مَنْ فَعَلَهَا،
مِثْلَ كَلِمَةٍ يَذْكُرُهَا بِلِسَانِهِ دَونَ قَلْبِهِ ، أَوْ كَلِمَةٍ يَذْكُرُهَا عَلَىَ وَجْهِ الْمَزْحِ وَاللَّعِبِ

پاشان زانایان چەندەها جۆر لە کوفریان باس کردووە چەندین نمونەیان لەسەر هێناوەتەوە، هەر دانەیەك لەو جۆرانە بەتەنها ، موسڵمانی پیێ کافر دەبێت (باسی ئەوەشیان کردووە کە بەتەنها یەك عەقیدە ، یان بەتەنها یەك کردەوە یان بە تەنها یەك گوتە کافر دەبێت ) ، خوێن و ماڵی ئەو کەسەشی پیێ حەڵاڵ دەبێت

بۆ موسڵمانان، هەتا ئەو زانایانە باسی چەند شتێکی بچوکیان کردووە ( کە لای خەڵکی بچوکن) کە هەرکەسێك بیکات پێی کافر دەبێت.
وەك: ئەگەر کەلیمەیەکی بەدەم گوت و بە دڵ باوەڕی پێی نەبوو ، یان ئەگەر کەلیمەیەکی گوت لە ڕووی گاڵتە و مەزاحەوە.

| |
|---|
| وَيُقَالُ أَيْضاً : الَّذِينَ قَالَ اللَّهُ فِيهِمْ { يَحْلِفُونَ بِاللَّهِ مَا قَالُوا وَلَقَدْ قَالُوا كَلِمَةَ الْكُفْرِ وَكَفَرُوا بَعْدَ إِسْلامِهِمْ } التوبة : ٧٤ . أَمَا سَمِعْتَ اللَّهَ كَفَّرَهُمْ بِكَلِمَةٍ مَع كَوْنِهِمْ في زَمَنِ رَسُولِ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم وَيُجَاهِدُونَ مَعَهُ ، وَيُصَلُّونَ ، وَيُزَكُّونَ ، وَيَحُجُّونَ ، وَيُوَحِّدُوْنَ ؟ |

وەڵامی حەوتەم : ئەوانەی کە الله لە بارەیانەوە فەرمویەتی:
{ يَحْلِفُونَ بِاللَّهِ مَا قَالُوا وَلَقَدْ قَالُوا كَلِمَةَ الْكُفْرِ وَكَفَرُوا بَعْدَ إِسْلامِهِمْ }
واتە :(ئەو مونافیقانە سوێند دەخۆن بە خودا کە شتی وایان نەگوتوە، سوێند بە خودا کەلیمەیەکیان گوت کە کوفر بوو، وە کافریش بوون لە دوای ئەوەی کە موسڵمان بوون)
گوێت گرت لە وتەی خودا کە ئەوانی بە کافر دانا بەوەی تەنها یەك کەلیمەیان گوتبوو، لەگەڵ ئەوەشدا چەندین چاکەی گەورە گەورەیان هەبوو، لەو چاکانەیان ئەوە بوو: لەزەمەنی پێغەمبەردا ﷺ بوون و لەگەڵ ئەودا جیهادیان دەکرد ونوێژیان دەکرد و زەکاتیان دەدا و حەجیان دەکرد و خودایان بە تەنها دەزانی و شەریکیان بۆ دانەدەنا.

| |
|---|
| وَكَذَلِكَ الَّذِينَ قَالَ اللَّهُ فِيهِمْ { قُلْ أَبِاللَّهِ وَآيَاتِهِ وَرَسُولِهِ كُنتُمْ تَسْتَهْزِئُونَ ، لا تَعْتَذِرُوا قَدْ كَفَرْتُمْ بَعْدَ إِيمَانِكُمْ } (التوبة : ٦٥، ٦٦) فَهَؤُلاَءِ الَّذِينَ صَرَّحَ اللَّهُ فيهم أَنَّهُمْ كَفَرُوا بَعْدَ إِيمَانِهِمْ وَهُمْ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي غَزْوَةِ تَبُوكٍ قَالُوا كَلِمَةً ذَكَرُوا أَنَّهُمْ قَالُوهَا عَلَى وَجْهِ الْمَزْحِ . |

هەروەها ئەوانەش کە خودا لەبارەیانەوە فەرمویەتی :

{ قُلْ أَبِاللَّهِ وَآيَاتِهِ وَرَسُولِهِ كُنتُمْ تَسْتَهْزِئُونَ ، لا تَعْتَذِرُوا قَدْ كَفَرْتُمْ بَعْدَ إِيمَانِكُمْ }

**واته :(پێیان بڵێ ئایه به خودا و به ئایەتەكانی و به پێغەمبەرەكانی گاڵتەجاڕی و سوكایەتیتان دەكرد. هیچ عوزرێ بۆ خۆتان نەهێننەوە، بەتەئكیدی ئێوه بوون به كافر دوای ئەوەی كه ئیمانتان هێنا بوو)**

**ئائەوانه كه خودا به ئاشكرا باسی ئەوانی كردووه كه كافر بوون پاش ئەوەی كه ئیمانیان هێنا بوو، لەگەڵ ئەوەشدا ئەوان لەگەڵ پێغەمبەری خودا بوون ﷺ له غەزای تەبوكدا، كەلیمەیەكیان گوتبوو، لای پێغەمبەر ﷺ عوزریان بۆ خۆیان هێنایەوە كه له ڕووی مەزاح و گاڵتەوە گوتبوویان .**

فَتَأَمَّلْ هَذِهِ الشُّبْهَةَ ، وهِيَ قَوْلُهُمْ تُكَفِّرُونَ مِن الْمُسْلِمِينَ أُنَاساً يَشْهَدُونَ أَنْ لا إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ ، وَيُصَلُّونَ وَيَصُومُونَ . ثُمَّ تَأَمَّلْ جَوَابَهَا ؛ فَإِنَّهُ مِنْ أَنْفَعِ مَا فِي هَذِهِ الأَوْرَاقِ

**جا تۆش جوان سەرنجی ئەم شوبهەیە بدە و لێی وورد بەرەوە ، ئەویش ئەوەیە كه دەڵێن : ئێوە كەسانێك له موسڵمانان به كافر دەزانن كه شایەدی دەدەن به (لا إِلَهَ إِلاَّ اللَّه ) و نوێژیش دەكەن و ڕۆژووش دەگرن، پاشان تۆش جوان له جوابەكەی ورد بەرەوە، لەبەر ئەوە وات پێ دەڵێم چونكه ئەمه بەسوودترین بابەته لەم كتێبەدا.**

وَمِنَ الدَّلِيلِ عَلَى ذَلِكَ أَيْضاً : مَا حكى اللَّهُ عَنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ مَع إِسْلاَمِهِمْ ، وَعِلْمِهِمْ ، وَصَلاَحِهِمْ أَنَّهُمْ قَالُوا لِمُوسَى {اجْعَلْ لَنَا إِلَهاً كَمَا لَهُمْ آلِهَةٌ} الأعراف : ١٣٨.
وَقَوْلُ أُنَاسٍ مِن الصَّحَابَةِ اجْعَلْ لَنَا ذاتَ أَنْوَاطٍ ، فَحَلَفَ النبيُّ صلى الله عليه وسلم أَنَّ هَذَا مِثْلَ قَوْلِ بنِي إِسْرَائِيلَ : { اجْعَلْ لَنَا إِلَهًا }[٣]

[٣] الترمذي: الفتن (٢١٨٠) ، وأحمد (٢١٨/٥).

وەڵامی هەشتەم: بەڵگەیەکی دیکەش ئەوەیە کە خودا لەبارەی نەوەکانی ئیسرائیلەوە بۆمان دەگێڕێتەوە ، لەگەڵ ئەوەدا موسڵمان بوون و خاوەنی عیلم بوون و صالح بوون. هاتن بە موسایان گوت :(ئەی موسا پەرستراوێکمان بۆ دابنێ ، وەك ئەو قەومەی تر کە پەرستراوێکیان هەیە )

بەڵگەیەکی دیکەش ئەوەیە کە کەسانێك لە ئەصحابەکان گوتیان :(ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ درەختێکمان بۆ دابنێ بۆ هەڵواسینی چەکەکانمان پێغەمبەریش سوێندی خوارد ئەمە وەك وتەکەی نەوەکانی ئیسڕائیلە کە گوتیان {اجْعَلْ لَنَا إِلَهاً كَمَا لَهُمْ آلِهَةٌ} درێژەی مەعنای حەدیسەکە بەمجۆرەیە :

[٤](أبو واقد الليثي) دەڵێت :( لەگەڵ پێغەمبەری خودادا (ﷺ) چوینە دەر بۆ حونەین. لەو کاتەشدا تازە موسڵمان بووین ، موشریکەکانیش دارێکی سیدریان هەبوو واتە داری نەبق لە پاڵیدا دەمانەوە بۆ موبارەکی. سیلاحەکانیان پێوە هەڵدەواسی بۆ موبارەکی پێیان دەگوت (ذات انواط) واتە درەختی هەڵواسین بۆ بەرەکەت . ئێمەش کە بەلای درەختەکەدا تێپەڕ بووین گوتمان ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ تۆش درەختێکمان بۆ دابنێ، وەك ئەوان چەکەکانمانی پێوە هەڵبواسین.

(واتە بۆ موبارەکی بۆ ئەوەی تیژ بێت و کاریگەری زۆر بێ لە سەر دوژمنان)

پێغەمبەریش ﷺ فەرموی : (الله أكبر) ئەوە ڕێبازەکانی پێشووە. سوێند بەو زاتەی ڕۆحی محمد ی بەدەستە ئەوەی وتتان، هەر وەك ئەوە وایە کە نەوەکانی ئیسڕائیل بە موسایان گوت : ئەی موسا پەرستراوێکمان بۆ دابنێ هەر وەك چۆن کافرەکان پەرستراوێکیان هەیە ، موساش فەرموی (بە ڕاستی ئێوە قەومێکن

---

٤ صحيح. أخرجه الترمذي (٢١٨٠). والطبراني في الكبير( ٣٢٩٠)

نەفامن ) سوێند بە خودا ئەی ئومەتەکەم ئێوەش دەکەونە شوێن ڕێبازی قەومەکانی پێش خۆتان). واتای حەدیسەکە تەواو

وَلَكِنْ لِلمُشْرِكِينَ شُبْهَةٌ يُدْلُونَ بِهَا عِنْدَ هَذِهِ القِصَّةِ ،
وَهِيَ أَنَّهُمُ يَقُولُونَ :إِنَّ بَنِي إِسْرَائِيلَ لَمْ يكْفُرُوا بِذَلِكَ ،
وَكَذَلِكَ الَّذِينَ قالُوا للنَّبِيِّ صلى الله عليه وسلم اجْعَلَ لَنا ذَاتَ أَنْوَاطٍ لم يكفروا.

بەڵام موشریکەکان شوبهەیەکیان دیکەیان هەیە لەگەڵ باسکردنی ئەم چیرۆکەدا دەیهێننە پێش، ئەمەش ئەوەیە کە دەڵێن :( نەوەکانی ئیسرائیل : بەو کارەیان نەبوون بە کافر ، هەروەها ئەوانەش کە بە پێغەمبەریان گوت درەختێکمان بۆ دابنێ بۆ هەڵواسینی چەکەکانمان دیسانەوە کافر نەبوون)

مەبەستی موشریکەکان ئەوەیە کە مادام هاوەڵانی موسا کە گوتیان ئەی موسا پەرستراوێکمان بۆ دابنێ، هاوەڵانی پێغەمبەریش گوتیان: درەختێکمان بۆ دابنێ بۆ موبارەکی ، لەبەر چاو وگوێی ئەو دوو گەورە پێغەمبەرەدا ئەو شتەیان گوت ، کەچی ئەو دوو پێغەمبەرە نەهاتن بەو کەسانە بڵێن ئێوە بوون بە کافر دەی تۆبە بکەن و موسڵمان ببنەوە. ئەی ئێوە چۆن ئێمە بە کافر دەزانن کە هاوار لە غەیری خودا دەکەین و سەربڕین بۆ غەیری خودا ئەنجام دەدەین .

فَالجَوَابُ أنْ تَقُولَ : إِنَّ بَنِي إِسْرَائِيلَ لَمْ يَفْعَلُوا ذلك،
وَكَذَلِكَ الَّذِينَ سَأَلُوا النَّبِيَّ صلى الله عليه وسلم لَمْ يَفْعَلُوا ذلك.
وَلاَ خِلاَفَ أَنَّ بَنِي إِسْرَائِيلَ لَوْ فَعَلُوا ذَلِكَ لَكَفَرُوا .
وَكذلك لاَ خِلاَفَ أَنَّ الَّذِينَ نَهَاهُم النَّبِيُّ صلى الله عليه وسلم لَوْ لَمْ يُطِيعُوهُ ، وَاتَّخَذُوا ذَاتَ أَنْوَاطٍ بَعْدَ نَهْيِهِ لَكَفَرُوا . وَهَذَا هُوَ الْمَطْلُوبُ

**لە وەڵامدا دەڵێین :( نەوەکانی ئیسرائیل ئەو کارەیان نەکرد، وە هەروەها ئەوانەی کە داوایان لە پێغەمبەر کرد ﷺ کە درەختەکەیان بۆ دابنێت ، خۆیان کارەکەیان نەکرد ( واتە لە دوای قەدەغەکردنەکەی پێغەمبەر ﷺ )**

**- جا هیچ ناکۆکیەك لە نێوان زانایاندا نییە لەوەدا ئەگەر نەوەکانی ئیسرائیل ئەو کارەیان بکردایە کافر دەبوون ،**

**- هەروەها هیچ ناکۆکیەك نییە کە ئەوانەی پێغەمبەر ﷺ نەهی لێکردن ئەگەر بێفەرمانی پێغەمبەریان بکردایە ﷺ درەختی هەڵواسینەکەیان بۆ خۆیان دابنایە، ئەوا کافر دەبوون ، ئەمەش هەمان مەبەستی ئێمەیە کە گوتمان :**

**(هەر کەسێك شیرك و کوفر بکات با ئەصحابەش بێت ، هەر کافر دەبێت ، و کردەوە چاکەکانی وەك شایەتومان و نوێژ و ڕۆژوو هیچ ئیستفادەیەکی پێ ناگەیەنێت)**

**وتەی** :( الشيخ سليمان بن عبد الله) رحمه الله :

( إن مَن أراد أن يفعلَ الشرك جَهلاً فنُهي عن ذلك فانتهى لا يكفر)

**واتە : هەرکەسێك ویستی شیرك ئەنجام بدات نەزانیش بوو، وپێی گوترا ئەو کارە دروست نییە ، ئەگەر یەکسەر وازی هێنا ، ئەوا ئەو کەسە کافر نابێت.**

وَلَكِنْ هَذِهِ الْقِصَّةُ تُفِيدُ : أَنَّ الْمُسْلِمَ بَل الْعَالِمَ قَدْ يَقَعُ فِي أَنْوَاعٍ مِنَ الشِّرْكِ لاَ يَدْرِي عَنْهَا. فَتُفِيدُ التَّعَلمَ وَالتَّحَرُّزَ ،

وَمَعْرِفَةَ أَنَّ قَوْلَ الْجَاهِلِ : (التَّوْحِيدُ فَهِمْنَاهُ) أَنَّ هَذَا مِنْ أَكْبَرِ الْجَهْلِ ، وَمكَائِدِ الشَّيْطَانِ .

وَتُفِيدُ أَيْضاً أنَّ الْمُسْلِمَ الْمُجْتَهِدَ الَّذِي إِذَا تَكَلَّمَ بِكَلاَمِ الْكُفْرِ وَهُوَ لاَ يَدْرِي فَنُبِّهَ عَلَى ذَلِكَ ، وَتَابَ مِنْ سَاعَتِهِ أَنَّهُ لاَ يَكْفُرُ ، كَمَا فَعَلَ بَنُو إِسْرَائِيلَ ، وَالَّذِينَ سَأَلُوا النبيَّ صلى الله عليه وسلم .

وَتُفِيدُ أَيْضاً أنَّهُ لَوْ لَمْ يَكْفُرْ فَإِنَّهُ يُغَلَّظُ عَلَيْهِ الْكَلاَمُ تَغْلِيظاً شَدِيدًا ، كَمَا فَعَلَ رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم

ئەم داستانە واتە :( هەردوو داستانی نەوەكانی ئیسرائیل و درەختی هەڵواسینەكە) پێنج پەند و عیبرەتی تێدایە :

پەندی یەكەم : موسڵمانی جاهیل بەڵكو زانای شەریعەتیش، هەندێ جار دەكەوێتە ئەنواعی شیركەوە هەر بە خۆشی نازانێت.

پەندی دووەم : فێربوونی تەوحید و ناسینی ئەنواعی شیرك واجبە لەسەر هەموو كەسێك، وە ووردبوونەوە لە گوتە و كردەوەی خۆمان بە ترسەوە واجبە، ئەوەش لە ترسی ئەوەی نەوەك شەریكمان بۆ خودا دانابێت و بە خۆمان نەزانیبێت.

پەندی سێیەم : تێدەگەین كە ئەو كەسە نەفامەی كە گوتی :( لە تەوحید بە جوانی حاڵی بووین) ئەمە یەكێكە لە گەورەترین نەفامیەكان و یەكێكە لە گەورەترین پیلانەكانی شەیتان.

كەواتە : پێویستە دەرسەكانی تەوحید و شەرحەكانی چەند جارە بكرێنەوە و ، بە جوانی خەڵكی لێ حاڵی بكرێت ، جا ئەگەر ئەو كۆمەڵە ئەصحابە ئەو كارە خراپەیان بەسەردا هات ئەی دەبێت كەسانی دیكە چیان بەسەر بێت.

پەندی چوارەم : موسڵمانی موجتەهید واتە ئەو كەسەی هەوڵ دەدات حەق بدۆزێتەوە، بەڵام لە نەزانیدا كەوتە هەڵەوە و بە خۆی نەزانی قسەیەكی كوفری گوت ( نەیزانی ئەو وتەیە نادروستە) و ئەگەر ئاگادار كرایەوە و یەكسەر وازی هێنا و پەشیمان بوویەوە، ئەوا بەكافر حساب ناكرێت هەروەك نەوەكانی ئیسرائیل و ئەو كۆمەڵە لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ یەكسەر وازیان هێنا و پەشیمان بوونەوە.

پەندی پێنجەم : هەركەسێك كەوتە كوفرەوە، ئەگەر عوزری هەبوو، ئەوا بەكافر دانانرێت، بەڵام گوتەی توند و ڕەقی بەرانبەر دەكرێت، هەروەك پێغەمبەر وای كرد ﷺ .

# بەشی سێهەم لە ( كشف الشبهات ) ڕەددانەوەی بەڵگەكانی دەستی موشریكان

وَلِلْمُشْرِكِينَ شُبْهَةٌ أُخْرَى : يَقُولُوْنَ : إِنَّ النَّبِيَّ صلى الله عليه وسلم أَنْكَرَ عَلَى أَسَامَةَ رضي الله عنه قَتْلَ مَنْ قَالَ :(لا إِلَهَ إِلا اللَّهُ) وَقَالَ : أَقَتَلْتَهُ بَعْدَ مَا قَالَ : لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ (٥)
وَكَذَلِكَ قَوْلُه : أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَقُولُوا لاَ إِلَهَ إِلا اللَّه
وَ أَحَادِيثُ أُخْرَى فِي الْكَفِّ عَمَّنْ قَالَهَا .
وَمرُادُ هَؤلاَءِ الْجَهَلَةِ أَنَّ مَنْ قَالَهَا لاَ يَكْفُرُ ، وَلاَ يُقْتَلُ وَلَوْ فَعَلَ مَا فَعَلَ

**موشریكەكان و گومڕاكان دەڵێن هەركەس گوتی (لا إِلَه إِلا اللَّه) لەدوای ئەوە هەرچی بڵێت و هەرچی بكات نە كافر دەبێت نە دەكوژرێت ، جا بۆ ئەوەی ئەم فكرە گەندەڵەی خۆیان بسەلمێنن چەند بەڵگەیەك بە دەستەوە دەگرن ، لەوانە:**

**بەڵگەی یەكەمیان: موشریكەكان بەڵگەیەكیان هەیە كە كردوویانە بە شوبهەیەكی دیكە، ئەویش حەدیسەكەی ئوسامەیە، دەڵێن: پێغەمبەر ﷺ ئینكاری لە ئوسامە كرد لە كوشتنی كەسێكدا لەدوای ئەوەی كە گوتبووی (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ)**

**بەڵگەی دوومیان: هەروەها ئەو حەدیسەش دەكەن بە بەڵگە كە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی :(فەرمانم پێدراوە كە لە دژی خەڵكی بجەنگم هەتا دەڵێن :( لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ ) چەندەها حەدیسی دیكەش دەكەن بە بەڵگە لە سەر وازهێنان لەو كەسانەی كە شایەتومان دەڵێن.**

---

(٥) صحيح البخاري: كتاب الصلاة (٣٩٣) وكتاب الزكاة (١٤٠٠) وكتاب الجهاد والسير (٢٩٤٦) وكتاب استتابة المرتدين والمعاندين وقتالهم (٦٩٢٤) وكتاب الاعتصام بالكتاب والسنة (٧٢٨٥) ، وصحيح مسلم: كتاب الإيمان (٢٠ ،٢١)

مەبەستی ئەو نەفامانە ئەوەیە كە هەركەس گوتی :( لاَ إِلَهَ إلاَّ اللَّهُ) نەكافر دەبێت و نەدەشكوژرێت با هەر چییەكی كرد بێت و هەر چییەك بكات.

فَيُقَالُ لِهَؤُلاءِ الْمُشْرِكِينَ الجُهّال : مَعْلُومٌ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم قَاتَلَ الْيَهُودَ ، وَسَبَاهُمْ ، وَهُمْ يَقُولُونَ :(لاَ إِلَهَ إلاَّ اللَّهُ)
وَأَنَّ أَصْحَابَ رَسُولِ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم قَاتَلُوا بَنِي حَنِيفَةَ ، وَهُمْ يَشْهَدُونَ أَنْ لاَ إِلَهَ إلاَّ اللَّهُ ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ ، وَيُصَلُّونَ ، وَيَدَّعُونَ الإِسْلاَمَ ،
وَكَذَلِكَ الَّذِينَ حَرَّقَهُمْ عَلِيُّ بنُ أَبِي طَالِبٍ رضي الله عنه بِالنَّارِ

وەلاٌمی گشتگیر :

لەوەلاٌمدا بەو موشریكە نەفامانە دەگوترێت :

مەعلومە كە پێغەمبەری خودا ﷺ چەندین جار لە دژی جولەكە جەنگاوە و ژنانی جولەكەی كردووە بە كەنیزەك و لەگەڵ ئەوەشدا ئەو جولەكانە دەیانگوت (لا إِلَهَ إلاَّ اللَّه)

وە ئەصحابەكانی پێغەمبەر ﷺ دژی بەنی حەنیفە جەنگین، لەگەڵ ئەوەشدا شایەتیان دەدا بە (لاَ إِلَهَ إلاَّ اللَّهُ) وە شایەدیان دەدا كە محمد ﷺ ڕەوانە كراوی خودایە، نوێژیشیان دەكرد و خۆشیان بە موسڵمان دەزانی. هەروەها ئەوانەش كە عەلی كوڕی ئەبو تاڵب بە ئاگر سوتاندنی، نوێژیان دەكرد و خۆشیان بە موسڵمان دەزانی.

وَهَؤُلاءِ الْجَهَلَةُ مُقِرُّونَ أَنَّ مَنْ أَنْكَرَ الْبَعْثَ كَفَرَ وَقُتِلَ وَلَوْ قَالَ لاَ إِلَهَ إلاَّ اللَّهُ ،
وَأَنَّ مَنْ جَحَدَ شَيْئًا مِنْ أَرْكَانِ الإِسْلاَمِ كَفَرَ وَقُتِلَ وَلَوْ قَالَهَا . فكَيْفَ لاَ تَنْفَعُهُ إِذَا جَحَدَ شَيْئًا مِن الْفُرُوعِ وَتَنْفَعُهُ إِذَا جَحَدَ التَوْحِيدَ الَّذِي هُوَ أَسَاسُ دِينِ الرُّسُلِ ، وَرَأْسُهُ

ئەو جاهیلە موشریكانە دان بەوەدا دەنێن كە هەركەسێك ئینكاری لە زیندوو بوونەوەی دوای مردن بكات كافر دەبێت و دەكوژرێت ئەگەر چی بشڵێت (لاَ إِلَهَ

إلاَّ اللَّهُ) دان بەوەشدا دەنێن کە هەرکەسێك ئینکاری هەر شتێ لە ڕوکنەکانی ئیسلام بکات کافر دەبێت و لەسەر ئەوەش دەکوژرێت با بشڵێت (لاَ إِلَهَ إلاَّ اللَّهُ)

ئادەی پێم بڵێن چۆن (لاَ إِلَهَ إلاَّ اللَّه) سودی پێ ناگەیەنێت ئەگەر ئینکاری یەکێ لە فەرعەکانی دین بکات، بەڵام سودی پێ دەگەنێت ئەگەر ئینکاری لە تەوحید بکات ، کە تەوحید ئەساسی دینی گشت پێغەمبەرەکانە و سەری هەموو دینە

وَلكِنَّ أَعْدَاءَ اللَّهِ مَا فَهِمُوا مَعْنَى الأَحَادِيثِ : فَأَمَّا حَدِيثُ أُسَامَةَ فَإِنَّهُ قَتَلَ رَجُلاً ادَّعَى الإِسْلاَمَ بِسَبَبِ أَنَّهُ ظَنَّ أَنَّهُ مَا ادَّعَى الإسلامَ إلاَّ خَوْفًا عَلَى دَمِهِ وَمَالِهِ . وَالرَّجُلُ إِذَا أَظْهَرَ الإِسْلاَمَ وَجَبَ الْكَفُّ عَنْهُ حَتى يَتَبَيَّنَ مِنْهُ مَا يُخَالِفُ ذَلِكَ . وَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى فِي ذَلِكَ { يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا ضَرَبْتُمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَتَبَيَّنُوا (النساء ٩٤)، أَيْ تَثَبَّتُوا . فَالآيَةُ تَدُلُّ عَلَى أنَّهُ يَجِبُ الْكَفُّ عَنْهُ ، وَالتَّثَبُّتُ ، فَإِذا تَبَيَّنَ مِنْهُ بَعْدَ ذَلِكَ مَا يُخَالِفُ الإِسْلاَمَ قُتِلَ لِقَوْلِهِ { فَتَبَيَّنُوا } وَلَوْ كَانَ لاَ يُقْتَلُ إِذَا قَالَهَا لَمْ يَكُنْ لِلتَّثَبُّتِ مَعْنًى

. بەڵام دوژمنانی خودا لە مەعنای حەدیسەکان حاڵی نەبوون

**یەکەم : وەڵامی حەدیسەکەی ئوسامە**: ئەوەیە کە ئوسامە لە کاتی جەنگدا پیاوێکی کوشت کە خۆی بە موسڵمان نیشان دا ، لەبەر ئەوەش کوشتی چونکە وای دەزانی کە ئەو پیاوە لە ترسی کوشتن و بۆ پاراستنی ماڵ و موڵکی، خۆی بە موسڵمان دەرخستووە.

مەعنای تەواوی حەدیسەکە ئەوەیە کە هەر کەسێك بە گوتنی (لاَ إِلَهَ إلاَّ اللَّهُ) ئیسلامەتی خۆی نیشاندا دەبێ وازی لێ بهێنرێت، ئەم وازهێنانەش بە یەکجاری نییە، بەڵکو وازهێنانێکی کاتییە، هەتا ڕوون دەبێتەوە ئایا بەردەوام دەبێت لە سەر ئیسلامەتیەکەی یان هەڵی دەوەشێنێتەوە، جا ئەگەر ئسیلامەتیەکەی هەڵوەشاندەوە، ئەو کاتە واجبە بەکافر دابنرێت و کوشتاری بکرێت با بشڵێت (لاَ إِلَهَ إلاَّ اللَّهُ)

لەو بارەیەشەوە خودا ئەو ئایەتەی دابەزاند

{ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا ضَرَبْتُمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَتَبَيَّنُوا} واتە :( ئەی ئەو كەسانەی كە ئیمانتان هێناوە كاتیٚ كە سەفەرتان كرد لە پێناوی خودادا بۆ جیهاد (لە هەرشتیٚ دڵنیا نەبوون ) پەلەمەكەن و لێی وورد ببنەوە و لێی بكۆڵنەوە)

ئایەتەكە مەعنای ئەوەیە هەر كەسیٚ گوتی (لاَ إِلَهَ إلاَّ اللَّه) دەبێت وازی لیٚ بهێنرێت و ووردبوونەوە لە حاڵی بكرێت جا ئەگەر لە دوای ئەوە هەر شتێكی پێچەوانەی ئیسلامی لێدەركەوت، ئەو كاتە دەكوژرێت چونكە فەرمویەتی (فتبینوا). جا ئەگەر بەو جۆرە بوایە كە بەتەنها وتنی (لاَ إِلَهَ إلاَّ اللَّه) كوشتنی لەسەر لا بچوایە ئەو كاتە هیچ مەعنایەك بۆ وردبوونەوە و لێكۆڵینەوە نەدەما.

وَكَذلِكَ الْحَدِيثُ الآخَرُ وَأَمْثَالُهُ ، مَعْنَاهُ مَا ذَكَرْناه أَنَّ مَنْ أَظْهَرَ التَّوْحِيدَ والإِسْلاَمَ وَجَبَ الْكَفُّ عَنْهُ إِلاَّ أَنْ يَتَبَيَّنَ مِنْهُ مَا يُنَاقِضُ ذَلِكَ .

وَالدَّلِيلُ عَلَى هَذَا أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ الَّذِي قَالَ أَقَتَلْتَهُ بَعْدَ مَا قَالَ : لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ ([٦])

وَقَالَ : أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَقُولُوا لاَ إِلَهَ إِلا اللَّهُ ([٧])

هُوَ الَّذِي قَالَ في الْخَوَارِجِ : أَيْنَمَا لَقِيتُمُوهُمْ فَاقْتُلُوهُمْ ([٨])، لَئِنْ أَدْرَكْتُهُمْ لأَقْتُلَنَّهُمْ قَتْلَ عَادٍ

## دووەم : وەڵامی هەتا دەڵێن: لاإله إلا الله

هەروەها ئەو حەدیسەی تریش ( كە فەرموی : فەرمانم پێدراوە لە دژی خەڵكی بجەنگم هەتا دەڵێن :(لاَ إِلَهَ إلاَّ اللَّه) ئەو حەدیسانەش كە لەم حەدیسە دەچن ، هەمان مەعنایان هەیە كە باسمان كرد. كە گوتمان : هەر كەسێك تەوحید و

---

[٦] صحيح البخاري: كتاب المغازي (٤٢٦٩) وكتاب الديات (٦٨٧٢) ، وصحيح مسلم: كتاب الإيمان (٩٦)

[٧] الشيخان

[٨] الشيخان واللفظ للمسلم

**ئیسلامەتی لە خۆیدا دەرخست، ئەو کاتە واجبە وازی لیٚ بهیٚنریٚت ، مەگەر دواتر کارو کردەوەیەکی لیٚ دەربکەویٚت کە پیٚچەوانەی شایەتومانەکەی بیٚت.**

**بەڵگەش لەسەر ئەوەی کە مەبەستی پیٚغەمبەر ﷺ ئەمە بووە. ئەوەیە کە ئەو پیٚغەمبەرە بە ئوسامەی فەرموو ( چۆن کوشتت دوای ئەوە کە گوتی (لاَ إِلَهَ إلاَّ اللَّه) وە کە فەرمویەتی: فەرمانم پیٚدراوە کە لە دژی خەڵکی بجەنگم هەتا دەڵیٚن : (لاَ إِلَهَ إلاَّ اللَّه) هەر هەمان پیٚغەمبەرە ﷺ کە لەبارەی خەواریجەوە [٩] فەرمویەتی: (لە هەر شویٚنیٚك پیٚیان گەیشتن بیانکوژن ئەگەر پیٚیان بگەم کوشتاریٚکیان دەکەم وەك کوشتاری قەومی عاد)**

مَع كَوْنِهِمْ مِنْ أَكْثَرِ النَّاسِ عِبَادَةً، وتَهْلِيلاً وتسبيحا، حَتَّى إِنَّ الصَّحَابَةَ يَحْقِرُونَ صَلاتَهُمْ عِنْدَهُمْ ، وَهُمْ تَعَلَّمُوا الْعِلْمَ مِن الصَّحَابَةِ . فَلَمْ تَنْفَعْهُمْ (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَهُ) ، وَلاَ كَثْرَةُ الْعِبَادَةِ ، وَلاَ ادِّعَاءُ الإِسْلاَمِ لَمَّا ظَهَرَ مِنْهُمْ مُخَالَفَةُ الشَّرِيعَةِ .

وَكَذلِكَ مَا ذَكَرْنَاه مِنْ قِتَالِ الْيَهُودِ ، وَقِتَالِ الصَّحَابَةِ رضي الله عنهم بَنِي حَنِيفَةَ .

**لەگەڵ ئەوەشدا ئەوانە (واتە خەواریج) کەسانیٚك بوون لە زۆربەی خەڵکی عیبادەتیان زیاتر دەکرد و زیاتر (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَهُ) یان دەگوت و سوبحانەڵلاَیان دەکرد.**

**هەتا ئەصحابەکانیش نویٚژەکانی خۆیان لە بەرامبەر نویٚژەکانی ئەواندا بەکەم دەزانی، ئەوانە زانستی شەرعیان لە ئەصحابەکانەوە وەرگرتبوو . ئەوجا گوتنی (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَهُ) بۆ ئەوان هیچ سودی نەبوو ، ئەوەش کە عیبادەتی زۆریان دەکرد بۆ خودا هیچ سودی نەبوو، ئەوەش کە خۆیان بە موسڵمان و بە ئەهلی ئیسلام دەزانی هەموو ئەمانە سوودیان نەبوو کاتیٚ ئەوەیان لیٚدەرکەوت کە لادان بوو لە شەریعەتی ئیسلام .**

---

[٩] خەواریج ، موسڵمانانیان بەوە کافر دەکرد کە گوناهی گەورەیان ئەنجام بدایە جگەلە کوفر

**هەروەها ئەوەش کە باسمان کرد لەبارەی کوشتاری جولەکەوە لەلایەن پێغەمبەرەوە ﷺ هەروەها جەنگ و کوشتاری ئەصحابەکان لە دژی (بەنی حەنیفە) ئەوانەی کە موسەیلەمەیان بە ڕەوانەکراوی خودا دەزانی،**

وَكَذَلِكَ أَرَادَ النَّبِيُّ صلى الله عليه وسلم أَنْ يَغْزُوَ بَنِي الْمُصْطَلِقْ لَمَّا أَخْبَرَهُ رَجُلٌ أَنَّهُمْ مَنَعُوا الزَّكَاةَ،(١٠) حَتَّى أَنْزَلَ اللَّهُ
{ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنْ جَاءَكُمْ فَاسِقٌ بِنَبَإٍ فَتَبَيَّنُوا } وَكَانَ الرَّجُلُ كَاذِباً عَلَيْهِمْ .
وكُلُّ هَذَا يَدُلُّ عَلَى أَنَّ مُرَادَ النَّبِيّ صلى الله عليه وسلم فِي الأَحَادِيثِ الْوَارِدَةِ مَا ذَكَرْنَاهُ

**هەروەها پێغەمبەر ﷺ ویستی غەزای بەنی موستەلەق بکات، ئەمەش کاتێک بوو کە یەکێ لە ئەصحابەکان خەبەری پێدا کە ئەو قەومە زەکات نادەن، هەتا خودا ئەو ئایەتەی دابەزاند** ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن جَآءَكُمۡ فَاسِقُۢ بِنَبَإٖ فَتَبَيَّنُوٓاْ ﴾ الحجرات: ٦ **واتە:( ئەی ئەوانەی کە ئیمانتان هێناوە ئەگەر فاسقێك خەبەرێکی بۆتان هێنا لێی بکۆڵنەوە و ڕوونی بکەنەوە) ئەو پیاوەش کە خەبەرەکەی هێنابوو درۆی کرد بوو بەناوی ئەوانەوە.**

**هەموو ئەمانە ئەوە دەردەخەن کە مەبەستی پێغەمبەر ﷺ لەو حەدیسانەدا ، ئەوەیە کە باسمان کرد (کە هەرکەسێك خۆی بە ئەهلی ئیسلام دەرخست واجبە وازی لێ بهێنرێت هەتا ئەوکاتەی شتێکی لێ دەردەکەوێت کە پێچەوانەی ئیسلام بێت)**

وَلَهُمْ شُبْهَة أُخْرَى ، وَهِيَ مَا ذَكَرَ النَّبِيُّ صلى الله عليه وسلم أَنَّ النَّاسَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ

---

[10] أحمد فى المسند

يَسْتَغِيثُونَ بِآدَمَ ، ثُمَّ بِنُوحٍ ، ثُمَّ بِإِبْرَاهِيمَ ، ثُمَّ بِمُوسَى ، ثُمَّ بِعِيسَى فَكُلُّهُمْ يَعْتَذِرُون ، حَتَى يَنْتَهُوا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم [11] . قَالُوا : فَهَذَا يَدُلُّ عَلَى أَنَّ الاسْتِغَاثَةَ بِغَيْرِ اللَّهِ لَيْسَتْ شِرْكاً

## بەڵگەی سێهەمیان : شەفاعەتی قیامەت و وەڵامەکەی

ئەو حەدیسەیە کە پێغەمبەر ﷺ باسی کردووە کە خەڵکی لە ڕۆژی قیامەتدا لە دەست ناڕحەتیەکانی قیامەت ، هاوار دەبەن بۆ ئادەم ، پاشان بۆ نوح پاشان بۆ ئیبڕاهیم پاشان بۆ موسا پاشان بۆ عیسا، بۆ ئەوەی شەفاعەت بۆ ئەو خەڵکە بکەن کە لەو ناڕەحەتیە ڕزگاریان بکات هەر هەموویان عوزر دەهێننەوە (کە ناتوانن شەفاعەت بکەن) هەتا لەکۆتایدا دەڕۆن بۆ لای پێغەمبەرمان محمد (ﷺ) ئەنجا ئەو موشریکانە دەڵێن : مادام ئەو خەڵکە هاواریان برد بۆ پێغەمبەران کەواتە بە بەڵگەی ئەم حەدیسە هاوار بردن بۆ غەیری خودا شیرك نییە.

وَالْجَوَابُ أنْ تَقُولَ : سُبْحَانَ مَنْ طَبَعَ عَلَى قُلُوبِ أَعْدَائِهِ
فَإِنَّ الاسْتِغَاثَةَ بِالْمَخلُوقِ فيمَا يَقْدِرُ عَلَيْهِ لاَ نُنْكِرُهَا ، كَمَا قَالَ تَعَالَى في قصة موسى:
{ فَاسْتَغَاثَهُ الَّذِي مِنْ شِيعَتِهِ عَلَى الَّذِي مِنْ عَدُوِّهِ } (القصص ١٥)
وَكَمَا يَسْتَغِيثُ إِنْسَانٌ بِأَصْحَابِهِ في الْحَرْبِ وَغَيْرِهِ فِي أَشْيَاءَ يَقْدِرُ عَلَيْهَا الْمَخْلُوقُ .

وەڵامەکەی ئەوەیە دەڵێین پاك و بێگەردی بۆ ئەو خودایە کە مۆری داوە لە دڵی دوژمنەکانی ، کارێکی بەسەر هێناون کە نەزانن هاواربردن بۆ غەیری خودا دوو جۆری هەیە جۆرێکیان دروستە و جۆرێکی دیکەیان شیرکە. چونکە هاواربردن بۆ مەخلوقاتەکانی خودا بۆ هەرکارێك کە توانیان هەبێت ئەمەیان ئێمە هیچ

---

[11] رواه البخاري في التوحيد (٧٥١٠) ، ومسلم في الإيمان (١٩٣) ، عن أنس بن مالك رضي اللّٰه عنه .

ئینكاری لیٚ ناكەین هەروەك خودا لەبارەی داستانی موساوە بۆمان دەگێڕێتەوە { فَاسْتَغَاثَهُ الَّذِي مِنْ شِيعَتِهِ عَلَى الَّذِي مِنْ عَدُوِّهِ }

واتە :(ئەو پیاوەی كە دۆستی موسا بوو هاواری برد بۆ موسا بۆ ئەوەی ڕزگاری بكات لە دەست ئەو پیاوەی كە دوژمنی بوو ) هەروەك ئینسان لە كاتی جەنگا و لە كاتەكانی دیكەشدا هاوار دەبات بۆ هاوەڵەكانی بۆ ئەوەی بێن لە هاواری لەو كارانەدا كە مەخلوقاتەكان دەتوانن ئەنجامی بدەن.

كەواتە هاواربردن چەند جۆرێكی هەیە :

یەكەم : هاوار بردن بۆ مردوان شیركە چونكە مردوو ناتوانێت بجوڵێت و ئاگادار نییە و ناشتوانێت هیچ بكات.

دووەم : هاواربردن بۆ كەسانی غائیب و نادیار شیركە چونكە ئەو كەسەی كە هاواری لێدەكرێت گوێبیست نییە و ئاگادار نییە لەو كەسەی كە هاواری لێدەكات

سێیەم : هاواربردن بۆ كەسێك كە زیندووە و حازرە داوای شتێكی لیٚ بكرێت كە لە توانایدا نەبێت، وەك ئەوەی داوای لیٚ بكات منالٚی پیٚ بدات یا هیدایەتی دلٚی بدات یان داوای لیٚ بكات بیپارێزێت لە دەست بەلاٚ و موصیبەتی نادیار، ئەمەش شیركە.

چوارەم : هاواربردن بۆ كەسێكی زیندوو كە حازر بێت لەگەلٚ ئەوەشدا داوای شتێكی لیٚ بكرێت كە لە توانای ئینساندا بیٚ ئەنجامی بدات ئەمەیان تەواوە.

وَنَحْنُ أنْكَرْنَا اسْتِغَاثَةَ الْعِبَادَةِ الَّتِي يَفْعَلُونَهَا عِنْدَ قُبُورِ الأَوْلِيَاءِ ، أَوْ فِي غَيْبَتِهِمْ فِي الأَشْيَاءِ الَّتِي لاَ يَقْدِرُ عَلَيْهَا إِلاَّ اللَّهُ

ئێمە ئینكاری (هاواربردنی عیبادەت) دەكەین ئەوەی كە لەلای قەبری ئەولیاكاندا ئەنجامی دەدەن، یان هاوار لە كەسێك دەكەن كە ئامادە نییە و داوای شتێكی لێدەكەن كە جگە خودا هیچ كەسی دیكە ناتوانێت ئەو كارە بكات.

إذَا ثَبَتَ ذَلِكَ فَالاسْتِغَاثَةَ بِالأنْبِيَاءِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ، يُرِيدُونَ مِنْهُمْ أنْ يَدْعُوا اللَّهَ أنْ يُحَاسِبَ النَاسَ حَتَّى يَسْتَرِيحَ أَهْلُ الْجَنَةِ مَنْ كَرْبِ الْمَوْقِفِ ، وَهَذَا جَائِزٌ فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ وذلك أنْ تَأْتِيَ عِنْدَ رَجُلٍ صَالِحٍ حي، يُجَالِسُكَ ، وَيَسْمَعُ كَلاَمَكَ ، فتَقُولُ لَهُ : ادْعُ اللهَ لِي

**جا مادام ئەمە ئیسپات بوو (كە دوو جۆر هاواربردن هەیە ) ئەوا هاواربردن بۆ پێغەمبەران لە ساحەی مەحشەردا لەو جۆرەیانە كە دروستە و شیرك نییە، چونكە ئەو خەڵكە داوا لە پێغەمبەران دەكەن كە داوا لە خودا بكەن، خودا موحاسەبەی ئەو خەڵكە بكات، بۆ ئەوەی ئەهلی بەهەشت لە ناڕەحەتیەكانی ئەو شوێنە سەختە نەجاتیان ببێت، ئەمەش جائیزە چ لە دونیادا بێت چ لە ئاخیرەت.**

**ئەمەش ئەوەیە كە بڕۆیت بۆ لای پیاوێكی صاڵح ، كە زیندوو بێت، لەگەڵت دابنیشێت و گوێی لە وتەكانت بێت ، تۆش پێی بڵێیت : داوا بكە لە خودا بۆم ،**

كَمَا كَانَ أَصْحَابُ رَسُولِ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم يَسْألُونَهُ في حَيَاتِهِ .

وَأَمَّا بَعْدَ مَوْتِهِ فَحَاشَا، وَكَلاَّ أَنَّهُمْ سَألُوهُ ذَلِك عِنْدَ قَبْرِهِ بَلْ أَنكَرَ السَّلَفُ الصالح عَلَى مَنْ قَصَدَ دُعَاءَ اللَّهِ عِنْدَ قَبْرِهِ ، فكَيْفَ بدُعَائه نَفْسهِ ؟ ( بأبي هو وبأمي)

**ئەمەش وەك ئەوەیە كە ئەصحابی پێغەمبەر ﷺ لە ژیانیدا داوایان لێدەكرد كە دۆعای خێری بۆ بكات. بەڵام لەدوای مردنی هەرگیز شتی وایان نەكردووە، ئەوە بوو ئەصحابەكان توشی چەندین ناڕەحەتی بوون، قەت نەهاتوون بۆ لای قەبرەكەی داوای دۆعای خێری لێ بكەن ، چونكە مەعلوم بوو لایان كە داواكردنی دوعا لە پێغەمبەر ﷺ تایبەت بووە بە كاتی زیندوویەتیەوە .**

**بەڵكو سەلەفی صالح ئینكاریان لەو كەسە كردووە كە هاتبێت لە لای قەبرەكەی لە خودا بپاڕێتەوە ( هەوەك عەلی كوڕی حوسەین ئینكاری لەو كەسە كرد كە لای قەبرەكەی پێغەمبەر ﷺ لە خودا دەپاڕایەوە)**

**جا ئەی ئەگەر كەسێك داوای لە پێغەمبەر بكردایە ﷺ دەبوو ئەصحابەكان چییان بكردایە؟ خۆم و دایك و بابم بە فیدای بین.**

## بەڵگەی چوارەمیان : داستانی ئیبراهیمە علیه السلام

وَلَهُمْ شُبْهَةٌ أُخْرَى ، وَهِي قِصَّةُ إبْرَاهِيمَ علیه السلام لَمَّا أُلْقِيَ في النَّارِ اعْتَرَضَ لَهُ جِبْرَائِيلُ علیه السلام فِي الْهَوَاءِ فَقَالَ له : أَلَكَ حَاجَةٌ ؟ فَقَالَ إِبْرَاهِيمُ علیه السلام : أَمَّا إِلَيْكَ فَلاَ قَالُوا : فَلَوْ كَانَتِ الاسْتِغَاثَةُ بِجِبْرَائِيلَ علیه السلام شِرْكاً لَمْ يَعْرِضْهَا عَلَى إبْرَاهِيمَ

**كاتێ بە فەرمانی نەمروود ئاگرێكی گەورە كرایەوە و ئیبراهیم هەڵدرایە ناوی كاتێ ئیبراهیم بە ئاسمانەوە بوو لە كاتی هەڵدانەكەدا، جوبرەئیل خۆی نیشاندا و گوتی ئایە هیچ پێویستیەكت هەیە؟ لەم كاتە سەختەدا هەتا بۆتی جێ بەجێ بكەم ؟ ئیبراهیم لە وەڵامدا گوتی: قەت پێویستیم بە تۆ نییە، بەڵكو پێویستیم بە خودایە.**

**ئەو موشریكانە ئەم داستانەیان كردووە بە بەڵگەی دەستیان و دەڵێن :**

**ئەگەر هاواربردن بۆ جوبرائیل شیرك بووایە ، جوبرەئیل نەدەهات عەرزی ئیبراهیمی بكات و بڵێت با بێم لە هاوارت و فریات بكەوم .**

فَالْجَوَابُ : أَنَّ هَذَا مِنْ جِنْسِ الشُّبهَةِ الأُولَى فَإِنَّ جِبْرَائِيلَ علیه السلام عَرَضَ عَلَيْهِ أَنْ يَنْفَعَهُ بِأَمْرٍ يَقْدِرُ عَلَيْهِ فَإِنَّهُ كَمَا قَالَ اللَّهُ تَعَالَى فِيهِ { شَدِيدُ الْقُوَى }(النجم : ٥)

فَلَوْ أَذِنَ اللَّهُ لَهُ أَنْ يَأْخُذَ نَارَ إِبْرَاهيمَ وَمَا حَوْلَهَا مِن الأَرْضِ ، وَالْجِبَالِ ، وَيُلْقِيَهَا في الْمَشْرِقِ ، أَوْ الْمَغْرِبِ لَفَعَلَ ، وَلَوْ أَمَرَهُ اللَّهُ أَنْ يَضَعَ إِبْرَاهِيمَ فِي مَكَانٍ بَعِيْدٍ لَفَعَلَ ،

وَلَوْ أَمَرَهُ أَن يَرْفَعَهُ إِلَى السَّمَاءِ لَفَعَلَ .

**له وەڵامدا دەڵێین : ئەمەش له هەمان جۆری بەڵگەکەی پێشووتریانه. چونکه جوبرەئیل ئەوەی خست پێش دەمی ئیبراهیم که کارێك بۆ ئیبراهیم ئەنجام بدات، که له توانایدا هەیه، هەروەك خودا لەبارەی جوبرەئیلەوه فەرمویەتی { شَدِيدُ اَلْقُوَى } واته :( جوبرەئیل خاوەنی هێزێکی زۆره) جا ئەگەر خودا ئیزنی بدایه که ئاگرەکەی ئیبراهیم و ئەرزەکەی و دەوروبەریشی، لەگەڵ کێوەکاندا هەڵبگرێت و له خۆرهەڵات یان له خۆرئاوا، دایان بنێت، دەیتوانی ئەنجامی بدات ئەگەر ئەمری پیٚ بدایه که ئیبراهیم هەڵبگرێت و له شوێنێکی دوور دایبنێت دەیتوانی بیکات.**

**ئەگەر خودا فەرمانی پیٚ بدایه که بەرزی بکاتەوه بۆ ئاسمان دەیتوانی بیکات .**

وَهَذَا كَرَجُلٍ غَنِيٍّ لَهُ مَالٌ كَثِيرٌ يَرَى رَجُلاً مُحْتَاجاً ، فَيَعْرِضُ عَلَيْهِ أَن يُقْرِضَهُ أَوْ يَهَبَهُ شَيْئاً يَقْضِي بِهِ حَاجَتَهُ ، فَيَأْبَى ذَلِكَ الرَّجُلُ الْمُحتَاجُ أَنْ يَأْخُذَ ، وَيَصْبِرُ حَتَّى يَأْتِيَهُ اللَّهُ بِرِزْقٍ لاَ مِنَّةَ فِيهِ لأَحَدٍ . فَأَيْنَ هَذَا مِنْ اسْتِغَاثَةِ الْعِبَادَةِ وَالشِّرْكِ لَوْ كَانُوا يَفْقَهُونَ ؟

**ئەو کارەی ئیبراهیمیش ، وەك پیاوێکی دەوڵەمەنده که سەروەت و سامانێکی زۆری هەبێت پیاوێکی فەقیر وموحتاج ببینێت و دەوڵەمەندەکه به فەقیرەکه بڵێت: با قەرزت پیٚ بدەم یان با شتێکت پیٚ بدەم که پێویستیەکەتی پیٚ پڕ بکەیتەوه، ئەو پیاوه موحتاجەش ڕەدی بکاتەوه و هیچی لیٚ وەرنەگرێت ، صەبر بگرێت هەتا خودا ڕزقێکی بۆ دەنێرێت و منەتی هیچ کەسی تێدا نەبێت. ئەمه له کویٚ و ئەو جۆره هاواربردنه له کویٚ که عبادەتکردنه و شیرکه ، ئەگەر حاڵی بوونایه که ئەمەیان جۆرێکه و ئەوەی دیکەش جۆرێکی دیکەی هاواربردنه ؟**

## بەشی چوارەم : و کۆتـایی مەسەلەکی گەورە و گرنگ

وَلْنَخْتِمْ الْكلام إن شاء الله تعالى بمسألةٍ عَظِيمَةٍ مُهِمَّةٍ تُفْهَمُ بِمَا تَقَدَّمَ ،
وَلكِنْ نُفْرِدُ لَهَا الْكَلاَمَ لِعِظَمِ شَأْنِهَا ، وَلِكَثْرَةِ الْغَلَطِ فِيهَا
فَنَقُولُ : لاَ خِلاَفَ أَنَّ التَّوْحِيدَ لابُدَّ أَنْ يَكُونَ بِالْقَلْبِ ، وَاللِّسَانِ ، وَالْعَمَلِ :
فَإِنْ اخْتَلَّ شَيْءٌ مِنْ هَذَا لَمْ يَكُنْ الرّجُلُ مُسْلِماً

**لە خاتیمە و کۆتایی ئەم کتێبە ( إن شاء الله) مەسەلەیەکی گەورە و گرنگ باس دەکەین کە لەو باسانەی پێشەوە لێی حاڵی دەبین، بەڵام لەبەر ئەوە بەجیا قصەی لێ دەکەین چونکە مەسەلەیەکی گەورەیە و غەڵەتی زۆری تێدا دەکرێت دەڵێین : هیچ ناکۆکیەك نییە لە بەینی تەواوی ئەهلی سوننەدا کە تەوحید واجبە بە دڵ و بە زمان و بە کردەوەش ئەنجام بدرێت ، جا هەرکەس هەر شتێ لەم سیانەی کەم بێت ئەوا ئەو کەسە بە هیچ شێوەیەك موسڵمان نییە**

فَإِنْ عَرَفَ التَّوْحِيدَ وَلَمْ يَعْمَلْ بِهِ فَهُوَ كَافِرٌ مُعَانِدٌ ،ككفر فِرْعَوْنَ وَإِبْلِيسَ ، وَأَمْثَالِهِمَا .
وَهَذَا يَغْلَطُ فِيهِ كَثِيرٌ مِنَ النَاسِ ، يَقُولُونَ :(هَذَا حَقٌ ، وَنَحْنُ نَفْهَمُ هَذَا ، وَنَشْهَدُ أَنهُ الْحَقُ ، وَلكِنّا لاَ نَقْدِرُ أَنْ نَفْعَلَهُ ، وَلاَ يَجُوزُ عِنْدَ أَهْلِ بَلَدِنَا إلاَّ مَنْ وَافَقَهُمْ ، أوَغَيْرَ ذَلِكَ مِنَ الأَعْذَارِ . وَلَم يَعْرِفْ الْمِسْكِينُ أَنَّ غَالِبَ أَئِمَّةِ الْكُفْرِ يَعْرِفُونَ الْحَقَّ ، وَلَمْ يَتْرُكُوهُ إلاَّ لِشَيْءٍ مِنَ الأَعْذَار، كَمَا قَالَ تَعَالَى { اشْتَرَوْا بِآيَاتِ اللَّهِ ثَمَنًا قَلِيلاً } (التوبة : ٩) ، وَغَيْرِ ذَلِكَ مِنَ الآيَاتِ ، كَقَوْلِهِ { الَّذِينَ آتَيْنَاهُمْ الْكِتَابَ يَعْرِفُونَهُ كَمَا يَعْرِفُونَ أَبْنَاءَهُمْ } (البقرة : ١٤٦)

**ئەوانەی کە لە تەوحید لایانداوە سێ جۆرن:**

**یەکەم : تەوحیدی ناسیوە و کاری پێ نەکردووە**

**دووەم :لە دڵەوە باوەڕی پێ نەهێناوە بە ڕوکەش کاری پێکردووە ئەوە مونافیقە**

سێیەم : تەوحیدی نەناسیوە و کاری پیێ نەکردووە ئەوە کافری جاهیلە.

یەکەمیان : هەرکەس تەوحید بناسێت و کاری پیێ نەکات ئەوە کافرێکی موعانیدە واتە: سەرکەشە وەك فیرعەون و ئیبلیس و هاوشێوەکانیان وەك زانایانی جولەکە کە حەقیان ناسیوە و کاریان پێنەکردووە، ئەم تەوحیدەش زۆرێك لە خەڵکی تیایدا دەکەونە غەڵەتەوە ، عوزر بۆ خۆیان دەهێننەوە و دەڵێن ( ئەم تەوحیدە حەقە، ئێمەش لەمە تێدەگەین ، شایەدیش دەدەن کە ئەمە حەقە، بەڵام ناتوانین کردەوەی پیێ بکەین ، چونکە هیچ کەس لای خەڵکی ئەم وڵاتە، ڕێگەی پیێ نادرێت ئەگەر وەك خۆیان نەبن، جا ئەگەر ئێمە کار بکەین بە تەوحید و دژایەتیان بکەین ئەوا توشی بەلا و موصیبەت دەبین، ژیانمان لێ تاڵ دەکەن ، یان غەیری ئەمەش چەندەها عوزری دیکە بۆ خۆیان دەهێننەوە.

ئەم هەژار و داماوە نازانێت کە زۆربەی پێشەوایانی کوفر حەقیان ناسیوە هەریەکەیان کە وازیان لەو حەقە هێناوە لەبەر عوزرێك وازیان هێناوە.

هەروەك خودای بڵند فەرمویەتی : { اشْتَرَوْا بِآيَاتِ اللَّهِ ثَمَنًا قَلِيلاً } (التوبة : ٩) واتە ( نرخێکی کەمیان هەڵبژارد لە جیاتی ملکەچ بوون بە ئایەتەکانی خودا ) غەیری ئەمەش چەندەها ئایەتی دیکەش هەیە کە ئەم مەسەلەیە ڕوون دەکاتەوە ، وەك ئەوەی کە فەرمویەتی

{ الَّذِينَ آتَيْنَاهُمْ الْكِتَابَ يَعْرِفُونَهُ كَمَا يَعْرِفُونَ أَبْنَاءَهُمْ } (البقرة : ١٤٦) واتە :(ئەوانەی کە خودا کتێبی تەورات و ئینجیلی پێداون پێغەمبەر و دینەکەی دەناسنەوە ﷺ و دەشزانن حەقە هەروەك چۆن مناڵەکانی خۆیان دەناسنەوە)

فَإِنْ عَمِلَ بِالتَّوْحِيدِ عَمَلاً ظَاهِراً وَهُوَ لاَ يَفْهَمُهُ ،
أو لاَ يَعْتَقِدُه بِقَلْبِهِ فَهُوَ مُنَافِقٌ ، وَهُوَ شَرٌّ مِنَ الْكَافِرِ الْخَالِصِ ، لقوله تَعَالَى :
{ إِنَّ الْمُنَافِقِينَ فِي الدَّرْكِ الأَسْفَلِ مِنْ النَّارِ وَلَنْ تَجِدَ لَهُمْ نَصِيرًا } (النساء :١٤٥)

دووەمیان : هەرکەس بە ئاشکرا کار بکات بە تەوحید ، بەڵام لە ناخەوە لێی حاڵی نەبووبێت ، یان لە دڵەوە عەقیدەی پیٚ نەبێت ، ئەوا ئەو کەسە مونافیقە ، و خراپتریشە لە کافری خالص ، ئەمەش بە بەڵگەی ئەوەی کە الله فەرمویەتی :{ إِنَّ الْمُنَافِقِينَ فِي الدَّرْكِ الأَسْفَلِ مِنْ النَّارِ وَلَنْ تَجِدَ لَهُمْ نَصِيرًا } (النساء :١٤٥)

واتە : مونافیقان لە پلەی هەرە خوارەوەن لە ئاگری جەهەننەمدا . واتە لە خوار کافرەکانەوەن .

| |
|---|
| وَهَذِهِ المسألة مَسْأَلَةٌ كبيرةٌ طَوِيلَةٌ تَتَبَيَّنُ لَكَ إِذَا تَأَمَّلْتَهَا فِي أَلْسِنَةِ النَّاسِ :<br>تَرَى مَنْ يَعْرِفُ الْحَقَّ ، وَيَتْرُكُ الْعَمَلَ بِهِ ؛ لِخَوْفِ نَقْصِ دنيَا ، أَوْ جَاهٍ ، أَوْ مُداراة لأحدٍ .<br>وَتَرَى مَنْ يَعْمَل بِهِ ظَاهِرًا لاَ بَاطِناً ، فَإِذَا سَأَلْتَهُ عَمَّا يَعْتَقِدُهُ بِقَلْبِهِ فإذا هُوَ لاَ يَعْرِفُه |

ئەم مەسەلەیە (واتە واجب بوونی تەوحید بە دڵ و بە زمان بە لاشە ) مەسەلەیەکی زۆر گەورەیە و زۆر درێژە ئەگەر سەرنجی حاڵی خەڵکی بدەیت بۆت ڕوون دەبێتەوە ، کەسانێك دەبینیت حەق دەناسێت ، لەگەڵ ئەوەشدا کاری پیٚ ناکات لەبەر عوزر و بیانوویەك یان لەبەر چەند عوزر و بیانوویەك لەوانە :

١. (لِخَوْفِ نَقْصِ دُنيَا) لە ترسی ئەوەی کە شتی دونیایی لە دەست بچێت بۆ نمونە بترسێت ئەگەر خەڵکی بزانن ئەم لەسەر تەوحید و یەکخوداپەرستیە، خەڵکی کڕین و فرۆشتنی لەگەڵ نەکەن یان دەنگی لیٚ دابڕن یان خزمایەتی نەکەن یان لە کار و وەزیفەکەی دووری بخەنەوە

٢. (أَو جَاه ) یان لە ترسی ئەوەی کە پلەو پایەکەی لە ناو خەڵکیدا لەدەست بچێت ، واتە بترسێت ئەگەر تەوحیدی لە خۆیدا بەدی هێنا، خەڵکی بە چاوێکی سوك تەماشای بکەن، یان لە پلە کۆمەڵایەتیەکانی دووری بخەنەوە.

٣. (أَوْ مُداراة لأحدٍ) یان لەبەر ڕازی کردنی کەسانێك کار ناکات بە تەوحید.

**٤. یان لەبەر خۆشەویستی ولآت و نیشتمان کار نەکات بە تەوحید ، چونکە ترسی ئەوەی هەیە ئەگەر کاری کرد بە تەوحید و ئینکاری لە شیرك کرد، لە ولآت دەری بکەن و شار بەدەری بکەن.**

**٥. یان لەبەر خۆشەویستی کەس و کار و عەشیرەت واز لە تەوحید دەهێنێت یان حاشا لە شیرك ناکات ، چونکە دەترسێت ئەگەر وای کرد کەسوکارەکەی لێ بڕەنجێت و لێی دوور بکەونەوە .**

**دیارە ئەمانە هیچیان عوزرەکانیان قبولّ نییە هەروەك دانەر ڕوونی دەکاتەوە و دەڵێت :**

وَلَكِنْ عَلَيْكَ بِفَهْم آيَتَيْنِ مِنْ كِتَابِ اللَّهِ تَعَالَى :
أُولاَهُمَا : قَوْلُهُ تعالى { لا تَعْتَذِرُوا قَدْ كَفَرْتُمْ بَعْدَ إِيمَانِكُمْ } (التوبة: ٦٦).
فَإِذَا تَحقَّقْتَ أَنَّ بَعْضَ الصَّحَابَةِ الَّذِينَ غَزَوا الرُّومَ مَع الرَسُولِ صلى الله عليه وسلم كَفَرُوا بِسَبَبِ كَلِمَةٍ قَالُوهَا عَلَى وَجْهِ الْمَزْحِ واللعب ، تَبَيَّنَ لَكَ أَنَّ الَّذِي يَتكَلَّمُ بِالْكُفْرِ، أو يَعْمَلُ بِهِ خَوْفًا مِنْ نَقْصِ مَالٍ ، أَوْ جَاهٍ ، أَوْ مُدَارَاةً لأَحَدٍ أَعْظَمُ مِمَّنْ يَتكَلَّمُ بِكَلِمَةٍ يَمْزَحُ بِهَا

**بەڵام واجبە لەسەرت لە دوو ئایەت حاڵی ببیت**
**(بۆئەوەی ئەم مەسەلەیەت بە تەواوی بۆ ڕوون ببێتەوە)**

**یەکەمیان: ئەوەیە کە خودا فەرمویەتی:** ﴿ وَلَئِن سَأَلْتَهُمْ لَيَقُولُنَّ إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلْعَبُ ۚ قُلْ أَبِاللَّهِ وَآيَاتِهِ وَرَسُولِهِ كُنتُمْ تَسْتَهْزِئُونَ ﴿٦٥﴾ لَا تَعْتَذِرُوا قَدْ كَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَانِكُمْ ۚ إِن نَّعْفُ عَن طَائِفَةٍ مِّنكُمْ نُعَذِّبْ طَائِفَةً بِأَنَّهُمْ كَانُوا مُجْرِمِينَ ﴿٦٦﴾ ﴾ **التوبة**

**ئەم دوو ئایەتە باسی ڕوداوێك دەکات لە غەزای تەبوکدا کە پیاوێك گوتی: (کەسمان نەبینیوە وەك ئەم قورئان خوێنانە ورگزل و درۆزن ، و ترسنۆك بن لە جەنگدا )، مەبەستی پێغەمبەری خودا و ئەصحابەکانی بوو ﷺ . (عەوفی کوڕی مالیك) کە لەو مەجلیسەدا ، ئامادە بوو، پێی گوت : درۆت کرد بەڵکو تۆ مونافیقیت، واللە دەڕۆم بۆ پێغەمبەری دەگێڕمەوە .**

**ئنجا عەوف چوو بۆ لای پێغەمبەری خودا ﷺ بۆ ئەوەی ئاگاداری بکاتەوە. دەبینێ پێش ئەوەی بگاتە ئەوێ قورئان لەو بارەیەوە دابەزیوە . ئەوجا پیاوەکە چوو بۆ لای پێغەمبەر ﷺ لەو کاتەدا دەبینێ، پێغەمبەر ﷺ شوێنەکەی جێ هێلاوە و سواری وشترەکەی بووە . پیاوەکە گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا ئێمە ئەو قسانەمان تەنها بۆ خۆشی و گاڵتە کردووە ، ماندوو بوونی ڕێگەمانی پێ لە بیر دەبەینەوە (واتە لە دڵەوە نەمان گوتووە )**

**(ابن عمر) دەڵێت : لەبەر چاومە، ئەو پیاوە خۆی بە قایشی وشترەکەی پێغەمبەرەوە هەڵواسی بوو. بە دەم ڕێوە قاچی لە بەردەڵان هەڵدەکەوت و دەیگوت :(ئێمە تەنها کاتمان بەو گوتانە بە سەر بردووە گاڵتەمان کردووە، (و بەڕاستیمان نەبووە )**

**پێغەمبەریش ﷺ لە جەوابدا ئەو ئایەتەی خۆندەوە کە مەعناکەی بەمجۆرەیە : (ئایە بە خودا و بە ئایەتەکانی خودا و پێغەمبەرەکەی گاڵتەجاڕیتان دەکرد ، عوزر مەهێننەوە (واتە هیچ عوزرێکتان لێ وەرناگیرێت). بە تەئکید ئێوە بوون بە کافر، پاش ئەوەی کە ئیمانتان هێنابوو ) پێغەمبەر (ﷺ) نەلای کردەوە بە لایاندا و نە لەوە زیاتری پێیان گوت)[١٢]**

**مادام لەم ڕووداوەوە بە جوانی بۆت ڕوون بوویەوە کە هەندێك لە ئەصحابەکان لە خزمەت پێغەمبەردا بوون ﷺ و لە دژی ڕۆمەکان غەزایان دەکرد، بوونەوە بە کافر ئەمەش بە هۆی کەلیمەیەکەوە، کە تەنها لە ڕووی گاڵتە و مەزاحەوە گوتبوویان، ئالێرەدا بۆت ڕوون دەبێتەوە : کە هەرکەسێك هەر جۆرە گوتەیەکی کوفری بێت بە دەمدا یان هەر جۆرە کردەوەیەکی کوفر بکات ،**

**لە ترسی ئەوەی کە سەروەت و سامانێکی لە دەست بچێت ،**

---

[١٢] حسن . تفسير ابن كثير والطبري وابن حاتم . حسّن إسناده الشيخ مقبل بن هادي الوادعي كما في صحيح السند من ( أسباب النزول )

**یان ڕێز و پلە و پایەی لای خەڵكی كەم بكات ،**

**یان لەبەر ڕازی كردنی هەركەسێك بێت ،**

**تاوانەكەی گەورە ترە لەو كەسەی كە بە گاڵتەوە كەلیمەیەكی كوفری دێت بە دەمیدا.**

**وَالآيَةُ الثَّانِيَةُ : قَوْلُهُ تَعَالَى**

﴿ مَن كَفَرَ بِٱللَّهِ مِنۢ بَعۡدِ إِيمَٰنِهِۦٓ إِلَّا مَنۡ أُكۡرِهَ وَقَلۡبُهُۥ مُطۡمَئِنُّۢ بِٱلۡإِيمَٰنِ وَلَٰكِن مَّن شَرَحَ بِٱلۡكُفۡرِ صَدۡرٗا فَعَلَيۡهِمۡ غَضَبٞ مِّنَ ٱللَّهِ وَلَهُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٞ ١٠٦ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمُ ٱسۡتَحَبُّواْ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا عَلَى ٱلۡأٓخِرَةِ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ١٠٧ ﴾ **النحل**

**فَلَمْ يَعْذُرُ اللَّهُ مِنْ هَؤُلاَءِ إِلاَّ مَنْ أُكْرِهَ مَعَ كَوْنِ قَلْبِهِ مُطْمَئِنًّا بِالإِيمَانِ ،**

**وَأَمَّا غَيْرُ هَذا فَقَدْ كَفَرَ بَعْدَ إِيمَانِه ، سَوَاءً فَعَلَهُ خَوْفاً ، أَوْ مُدَارَاةً ، أَوْ مَشَحَّةً بِوَطَنِهِ ، أَوْ أَهْلِهِ ، أَوْ عَشِيرَتِهِ ، أَوْ مَالِهِ ، أَوْ فَعَلَهُ عَلَى وَجْهِ الْمَزْحِ ،**

**أَوْ لِغَيْرِ ذَلِكَ مِن اَلأَغْرَاضِ إِلاَّ الْمُكْرَهَ.**

**ئایەتی دووەمیان ئەوەیە كە خودای بڵند فەرمویەتی:**

﴿ مَن كَفَرَ بِٱللَّهِ مِنۢ بَعۡدِ إِيمَٰنِهِۦٓ ﴾ **واتە :( هەركەسێك كوفر بكات بە خودا ، لە دوای ئەوەی كە ئیمانی هێنا و بوویە موسڵمان)**

﴿ إِلَّا مَنۡ أُكۡرِهَ ﴾ **جگە لەو كەسەی كە (دوو شەرتی تێدا بێ) شەرتی یەكەم زۆری لێ دەكرێت ، بە هەڕەشەی كوشتن یان بە سزایەكی سەخت كە ناتوانێت خۆی لێ دەرباز بكات.**

﴿ وَقَلۡبُهُۥ مُطۡمَئِنُّۢ بِٱلۡإِيمَٰنِ ﴾ **شەرتی دووەم : ئەو زۆر لێكراوە دڵی بە ئیمان ئارام بێت ، ئەوە كافر نابێت.**

﴿ وَلَٰكِن مَّن شَرَحَ بِٱلۡكُفۡرِ صَدۡرٗا ﴾ **بەڵام ، جگە لەو زۆر لێكراوەی كە باسكرا، هەركەس كوفر بكات ئەوە دڵی بە كوفر كراوەتەوە.**

**﴿ فَعَلَيۡهِمۡ غَضَبٞ مِّنَ ٱللَّهِ وَلَهُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٞ ﴾ ئەوا ئەو کەسانە غەزەبێکی گەورەی خودایان لەسەرە و عەزابێکی گەورەیان هەیە.**

**﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمُ ٱسۡتَحَبُّواْ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا عَلَى ٱلۡأٓخِرَةِ﴾ ئەو کافر بوونەی ئەوان و ئەو عەزابەش لەبەر ئەوەیە کە ئەوانە ژیانی دونیایان هەڵبژارد بەسەر پاداشتی قیامەت و ڕەزامەندی خودادا).**

**خودا هیچ کام لەو کەسانەی بە خاوەن عوزر دانەناوە ، جگە لەو کەسەی کە زۆری لێدەکرێت و لەهەمان کاتیشدا دەبێت دڵی بە ئیمان ئارام بێت.**

**بەڵام جگە لەم کەسە ، هەرکەسێکی دیکە دوای ئیمان هێنان کوفر بکات ، ئەوا کافر دەبێت ، فەرقی نییە لە ترسا ئەو کارە بکات ،**

**یان لەبەر ڕازی کردنی هەرکەس و هەر لایەنێك بێت ،**

**یان لەبەر خۆشەویستی وڵات و نیشتمان بێت ،**

**یان لەبەر کەس و کارەکەی بێت ،**

**یان لەبەر عەشیرەتەکەی بێت ، یان لەبەر ماڵ و موڵکەکەی بێت ،**

**یان لە ڕووی گاڵتە و مەزاحەوە ئەو کوفرە بکات ،**

**یان لەبەر هەر مەبەستێکی دیکە بێت ، ئەوانە هیچیان عوزریان نییە ، جگە لەو کەسەی کە بە زۆری زۆرداری ناچاریان کردووە کە کوفر بکات.**

فَالآيَةُ تَدُلُّ عَلَى هَذَا مِنْ جِهَتَيْنِ :
الأُولَى : قَوْلُهُ :{ إِلاَّ مَنْ أُكْرِهَ } فَلَمْ يَسْتَثْنِ اللهَ تعالى إِلاّ الْمُكْرَهَ . وَمَعْلُومٌ أنَّ الإِنْسَانَ لاَ يكْرَهُ إِلا عَلَى الْكَلاَمِ ، أو الْفِعْلِ ، أما عَقِيدَةُ الْقَلْبِ ، فَلاَ يُكْرَهُ عَلَيْهَا أَحَدٌ .
الثَّانِيَةُ : قَوْلُهُ تَعَالَى { ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ اسْتَحَبُّوا الْحَيَاةَ الدُّنْيَا عَلَى الآخِرَةِ }
فَصَرَّحَ أنَّ هذا الكفرَ والْعَذَاب لَمْ يَكُنْ بِسَبَبِ الاعْتِقَادِ ، أو الْجَهْلِ ، أو الْبُغْضِ لِلدِّيْنِ ، أَوْ مَحبَّةِ الْكُفْرِ ، وَإِنَّمَا سَبَبُهُ أَنَّ لَهُ فِي ذَلِكَ حَظًّا مِنْ حُظُوظِ الدُّنْيَا ، فآثَرَهُ عَلَى الدِّينِ

**ئەم ئایەتەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە باسمان کرد لە دوو لاوە :**

**یەکەمیان : فەرموی : { إِلاَّ مَنْ أُكْرِهَ } جگە لەو کەسەی کە زۆری لێکراوە ، مەعلومە کە ئینسان زۆری لێ ناکرێت جگە گوتن یان ئەنجامدانی کردەوە ، بەڵام لە عەقیدەی ناو دڵ هیچ کەسێك زۆری لێ ناکرێت.**

**دووەمیان : فەرموی : { ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ اسْتَحَبُّوا الْحَيَاةَ الدُّنْيَا عَلَى الآخِرَةِ } ئاشکرای کرد کە ئەو کوفرەی ئەوان و ئەو عەزابەش بە هۆی ئەوە نەبووە**

- **کە عەقیدەیان بە کوفر بووبێت ( وەك مورجیئەکان دەڵێن )**
- **یان بە هۆی ئەوە نەبووە نەفام و نەزان بوون.**
- **یان بە هۆی ئەوە نەبووە کە ڕقیان لە دین بوو بێت.**
- **یان بەهۆی ئەوە نەبووە کوفریان خۆش ویستبێت.**

**بەڵکو سەبەب و هۆکاری کوفرەکەیان ئەوە بووە کە بەشێکیان لە بەشەکانی دونیا هاتووەتە پێش ، ئەوانیش ئەو بەشەیان هەلبژاردووە بەسەر دیندا .**

**لێرەدا ئیمام کۆتایی بەم نامە پڕ بەرەکەتە دەهێنێت و منیش لەگەڵ ئەودا دەڵێم**

وَاللَّهُ سبحانه وتعالى أَعْلَمُ وصلى الله على نبينا محمد وآله وصحبه وسلم.

**:الحمد لله لە مانگی شعبانی ١٤٣٢ لەپاش هیجرەتی موستەفا ﷺ بە فەزلّ و منەتی ﷻ تەرجەمە و ڕوونکردنەوەی ئەم کتێبە پڕ خێرە کۆتایی هات خودا جەزای دانەرەکەی بداتەوە و خودا لەویش و لە هەموو زانایانی ئەم ئوممەتە خۆش بێت ئەوانەی بوون بە میراتگری پێغەمبەران علیهم الصلات والسلام**

**إدريس بن عبد العزيز**

سبحانك اللهم وبحمدك أشهد أن لا إله إلا أنت أستغفرك وأتوب إليك

**گرنگرتین سەرچاوەکان :**

📖 **(تفسير ابن كثير)**

📖 **تفسير السعدي**

📖 **تفسير البغوي**

📖 **تفسير ابن عاشور**

📖 **شەرحەکانی (كشف الشبهات )**

## ناوەڕۆك (الفهرس)

پێشەكی ........................................................ ٤

بەشی یەكەم لە (كشف الشبهات) ........................................... ٦

بڕگەی یەكەم : بانگەوازی تەواوی پێغەمبەران بۆ ئەوە بووە كە الله بەتەنها بپەرسترێت........................................................ ٦

بڕگەی دووەم : عەقیدە و كردەوەی ئەوانەی كە پێغەمبەریان بۆ ڕەوانە كرابوو ٨

بڕگەی سێیەم : ئەو تەوحیدەی كە كافرەكان ئینكاریان لێكرد و لەسەری جەنگ لە دژیان بەرپا كرا ، تەوحیدی یەكخوداپەرستی بوو .........................١٣

بڕگەی چوار : موشریكەكان مەعنای لااله الا الله یان دەزانی .................. ١٧

بڕگەی پێنجەم : ناكۆكی خەڵكی لە بارەی مەعنای پەرستراویەوە .............٢٠

بڕگەی شەشەم : دڵخۆش بوون بە ناسینی تەوحید و ناسینی پێچەوانەكەی بەجوانی ........................................................٢٣

بڕگەی حەوتەم:ئایا جەهل یان تەئویل لە شیركی گەورەدا عوزرە یا عوزر نیە؟٢٦

بڕگەی هەشتەم : هەموو پێغەمبەرێك، خودا دوژمنی بۆ داناون كە ئەو دوژمنانە بەڵگەی خۆیان پێیە بۆ دژایەتی كردنی پێغەمبەران و شوێنكەوتوەكانیان ... ٢٨

بڕگەی نۆ : بۆ بەرەنگار بوونەوەی دوژمنانی دین خۆ چەكدار كردن بە زانستی شەرعی ، زەرورەتە ................................................ ٣٠

بڕگەی دەهەم : ئەهلی تەوحید هەمیشە سەركەوتووە با عەوامیش بێت...... ٣٣

بڕگەی یازدە : قورئان پڕە لەو بەڵگانەی كە ڕەددی گومڕایی دەداتەوە. .......٣٤

بەشی دووەم لە كتێبی ( كشف الشبهات ) ................................ ٣٦

بڕگەی دوازدە: ڕەدد و وەڵامی گشتگیر بۆ گومڕایان......................... ٣٧

شوبهەی یەكەم : دەڵێن : هەر كەس تەنها الله بە پەروەردگار بزانێت ئەوە شەریكی بۆ خودا دانەناوە...........................................٤٢

شوبهەی دووەم : دەڵێن: كافرەكان داوایان لە بتەكان دەكرد و ئێمە داوا لە صاڵحان دەكەین...............................................٤٥

شوبهەی سێیەم : دەڵێن : كافرەكان داوای پێویستیەكانیان لە صاڵحان دەكرد ، بەڵام ئێمە داوایان لیَ دەكەین تكامان بۆ بكەن لای خودا.....................٤٩

شوبهەی چوارەم : دەڵێن : پەنابردن و داواكردن لە صاڵحان عیبادەت نییە...٥١

شوبهەی پێنجەم : دەڵێن : ئایە ئینكاری لە شەفاعەتی پێغەمبەر دەكەیت؟ ...٥٤

شوبهەی شەشەم : دەڵێن : پەنابردن بۆ صاڵحان شیرك نییە یان دەڵێن شیرك تەنها بتپەرستیە............................................... ٥٨

شوبهەی حەوتەم : دەڵێن : كافرەكانی كۆن تەنها بەوە كافر بوون كە گوتیان خودا كوڕ و كچی هەیە........................................... ٦٣

شوبهەی هەشتەم : ............................................... ٦٦

شوبهەی نۆیەم: دەڵێن هەر كەس گوتی لاإله إلا الله، بە هیچ شتیَ كافر نابێت ٧١

بەشی سێهەم لە (كشف الشبهات) ڕەددانەوەی بەڵگەكانی دەستی موشریكان٨٥

یەكەم : وەڵامی حەدیسەكەی ئوسامە.................................. ٨٧

دووەم : وەڵامی هەتا دەڵێن: لاإله إلا الله.................................. ٨٨

بەڵگەی سێهەمیان : شەفاعەتی قیامەت و وەڵامەكەی ......................٩١

بەڵگەی چوارەمیان : داستانی ئیبڕاهیمە..................................٩٤

بەشی چوارەم : و كۆتایی مەسەلەكی گەورە و گرنگ..................... ٩٦

لەم زنجیرەیە تا ئێستا :

١. سیٚ بنچینەکانی دین (الأصول الثلاثة)

٢. یەکتاپەرستی (کتاب التوحید)

٣. ڕوناکی شار و دێهات شەرحی (کشف الشبهات)